یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا
مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم
15
ئاب
2009



تەنها ژنێك بەس نییە!!

ڕەمەزان مانگی بەخشندەیی و میهرەبانی!

بۆ منداڵەکەت بخوێنەوە!

KENNETH HAHN HALL OF ADMINISTRATIO

دیاردەکانی جێهێشتنی کارگێڕی!

ڕێز لە هەست وسۆزی خێزانەکەت بگرە!

ببە بە خاوەنی دەستێکی سپی!!

بۆ ئەوەی هەردەم ئاسوودە بژیت!

بەرگێك بۆ دۆزینەوەی مرۆڤە ژیرەکان!!

ئاسانترین ڕێگە بۆ پاشەکەوتکردنی مووچەکەت!




بۆ
نەوەیەکی هۆشیار
بۆ
پەروەردەیەکی دروست
بۆ
دەروونێکی ئاسودە
بریار هەڵبژێرە!!

## ئەم هەلە لە دەست خۆت مەدە!

بەبۆنەی هاتنی مانگی رەمەزانی پیرۆزەوە نرخی بەشداری ساڵانەی گۆڤاری بریارمان داشکاند - لە ٣٠٠٠٠ بۆ ٢٥٠٠٠ دینار.

پوختەی سێ کتێبی کارگێڕی جیهانی (خلاصات) تەنها بە ١٠٠٠٠دینار.

هەڵبژاردەی گۆڤارە کارگێڕییە جیهانییەکان(المختار الإداري) سێ ژمارە تەنها بە ١٠٠٠٠دینار.

هەڵبژاردەی جوانترین و بەناوبانگترین بابەتەکانی (علاقات) سێ ژمارە تەنها بە ١٠٠٠٠دینار.

بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی بکەن بە ژمارە تەلەفۆنەکانی «بریار»ەوە.

The first Magazin Especializined in Management
and Human Development in Kurdistan

# بریار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم - ژمارە 15 - ئابی 2009

























**بۆ دابەشکردنی بریار**

**هەولێر:** ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٢ خانەی سیروان
**کەرکوک:** ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ **هەڵەبجە:** ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ ٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧
**دەربەندیخان:** ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ **کفری:** ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ **کەلار:** ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
**چەمچەماڵ:** ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ **کۆیە:** ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ **سۆران:** ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
**چۆمان:** ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ **قەڵادزێ:** ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ **رانیە:** ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

**تیراژ: ٣٠٠٠ دانە**
چاپخانەی سەردەم

## خاوەنی ئیمتیاز
ئەندازیار مەسعود تاهیر رۆژبەیانی

## سەرنووسەر
عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com
07705033131

## پەیوەندییەکان
محەمەد هاشم
بەرزان ئەبوبەکر

## دیزاین
جەمال دەروێش
قەیدار رەحیم

## راوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

### مەرجەکانی بڵاوکردنەوە

داوا لە هەموو ئەو ئازیزانە دەکەین کە بابەت بۆ گۆڤارەکەمان دەنێرن رەچاوی ئەم خاڵانە بکەن بە پێچەوانەوە هەر نووسینێك ئەم خاڵانە رەچاو نەکات پشتگوێ دەخرێت.

١- نابێت لە نیو لاپەرەی (A٤) بە فۆنتی (١٢) کە متر بێ و لە دوو لاپەرەش زیاتر بێت.

٢- دەبێت ئاماژە بە سەرچاوە بکرێت لە هەر دوو حاڵەتی وەرگێران و نووسیندا.

٣- دەبێت نـاو یان نازناو بنووسرێت، نازناوی باوك یان دایك پەسەند نییەو هیچ بابەتێك لێرە بە دواوە بەو نازناوە بڵاوناکرێتەوە.

٤- بابەتەکە بە ئیمێل بنێردرێت و ژمارەی مۆبایلی لەسەر بێت.

٥- ئەو بابەتە یەکەمجار بێت بڵاو بکرێتەوەو پێشتر لە هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەکی تردا بڵاو نەکرابێتەوە.

## ناونیشانی گۆڤار
سلێمانی- شەقامی سالم- تەلاری سلێمانی مۆڵ، نهۆمی/2
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
07702178682 3193946
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر- شەقامی گولان بەرامبەر دەزگای ئاراس
07504463230 07507658535

حساب بانکی گۆڤاری بریار
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی:
٣٣٧١

با مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بکەینە
ژووانی خۆشەویستی و بەخشندەیی
و میهرو تەبایی و خزمەتکردنی
میللەتەکەمان!
با بیکەینە مانگی یارمەتیدان و
دڵنەوایی کردنی هەژاران و بێ نەوایان
بۆ ئەوەی لە ئان و ساتی بەربانگ و
پارشێودا
دەستە بچکۆلەکان
لەپەروەردگاری مەزن داوای
لێخۆشبوونمان بۆ بکەن!

شهر الرحمة والمغفرة
SHAHRALRAHMA
Ramadan Kareem

پیرۆزبێت هەڵاتنی هیلالی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز

# یەکەم دڵۆپ



## پەرەپێدان

هەموو رۆشنبیرێکی دڵسۆزو مرۆڤ دۆستو ولاتپەروەر یەکێك لە خەمە گەورەکانی پەرەپێدانو گەشەپێدانو پێشکەوتنە بە هەموو رەهەندەکانییەوە، بە ئاواتەوەیە وڵاتو هاوڵاتیانی لە ئایندەیەکی نزیکدا لەوپەڕی پەرەپێدانو پێشکەوتندا ببینێت.

مافی هەر یەکێکە لە ئێمەش کە داوای کارکردنی خێراو هەنووکەیی بکەین، چونکە رەورەوەی پێشکەوتن لە جیهانی پێشکەوتوودا خێرایەو ئەگەر ئێمە تەنها بە هیوای گەیشتن بەوان کار بکەین، ئەوان ناوەستن تا ئێمە بیان گەینێ، بەڵکو خوخلۆکەی پێشکەوتن لای ئەوان لە جوڵە ناوەستێتو ئەو کاتەش ئێمە هەر لە دوای ئەوانەوە دەبین.

ئەمە وێڕای گرفتو کێشەکان رۆژ بە رۆژ زیاد دەکەنو دەست دەخەنە بینەقاقای پێشکەوتنو پەرەپێدان.

گرفتەکانی (کەم خۆراکیو بێ ئاویو وشکەساڵیو زۆربوونی زەوی بەیار بە هۆی فەرامۆشکردنی کشتوکاڵەوە، بێکاریو هەژاریو نەخۆشیو زۆربوونی دانیشتووانو هێرشی بازارەکانو کێشە ئەمنیو ناوخۆییو دەرەکییەکان)، ئەگەر نەتوانین گەمارۆیان بدەین ئەوا گەمارۆمان دەدەنو دەبێت هەر لە بازنەیەکی داخراودا سەرگەردان بین!!

کەواتە پەرەپێدانو پرۆسەی ریفۆرمو رینیسانسو دوبارە بیناسازی تاکە چارەسەری هەموو کێشەکانە.

بە پەرەپێدان ئابوریو ئاسایشی نەتەوەیی دەپارێزینو خەڵکی لە بێکاری رزگار دەکەین، کە بە رای من دایکی هەموو کێشەکانە، چونکە مرۆڤی بێکار تەنها هەست بە بێکاری ناکات بەڵکو بەهۆی بێکارییەوە خۆی بە خاوەنی هیچ نازانێتو تەنانەت وڵاتەکەشی بە وڵاتی خۆی نازانێت، چونکە بە رای ئەو نەیتوانیوە پاروە نانێکیشی بۆ دابین بکات، ئەمە وێڕای شوێنەوارە ئاکارییە دزێوەکانی، کە تیایدا رێزگرتن لە خۆیو دەوروبەر لە دەست دەداتو متمانەی بە خۆی نامێنێتو پەنا بۆ راکردن لە واقیع دەبات، لە رێگای خواردنەوەو قومارو مادە هۆشبەرەکانو پێکەوەنانی پێرو گروپی شەرانگێزو گێرە شێوێن، وێڕای پچڕانی شیرازەی خێزانو چەندین هەڕەشەی کۆمەڵایەتی تر.

ئەو کاتەش دەتوانیت چاوەڕوانی پێشکەوتنو گەشەپێدان لەگەڵ بکەیت کە پارووە نانەکەی ئازاد بێت، چونکە گەلان تا پاروەکەی دەمیان ئازاد نەبێت عەقڵیشیان ئازاد نابێتو ناتوانن بە ئازادیو بەبێ ترس گوزارش لە راوبۆچوونو ئیختیاری خۆیان بکەن!!

پەرەپێدان رێگایە بەرەو ئازادی رۆشنبیریو سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو بنیاتنانی ژیانێکی بەرزو پیرۆز.

پەرەپێدان رێگایە بۆ دروستکردنی ئابورییی پتەو کە بڕبڕەی پشتی پێشکەوتنو هێزو دەسەڵاتە.

پەرەپێدان گەیشتنە بە کاروانی گەلانی پێشکەوتوو خوازو پێشکەوتوو و ئازادو نوێخواز.

پەرەپێدان سود وەرگرتنە لە هەموو دروستکراوە تەکنەلۆژییەکانی سەردەم نەك ئالودە بوون بە دەست بەکارهێنانو مشەخۆرییەوە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین پەرەپێدان هەرگیز لە ژێر سایەی هەژاریو کۆنترۆڵکردنی سەروەتو سامانو فەوزاو بێ بەرنامەییو سیستەمی نارێکدا نایەتە بەرهەم!

بەڵکو بۆ بڕیاری ئازایانەی راستەقینەی پەرەپێدان پێویستە لەسەرمان کە:

١- ئاستی ئابوریو بژێوی خەڵك بەرز بکەینەوەو رەفاهی ئابوری دەستەبەر کەین.

٢- ئابوری نیشتمانی پێکەوەنێینو ببینە خاوەنی خەزێنەیەکی دەوڵەمەند.

٣- گەل رۆشنبیر بکەینو لە پاشکۆیەتیو دواکەوتوویی رزگاری بکەین.

٤- دابینکردنە خزمەتگوزارییە پێویستەکان وەك (چاودێری تەندروستیو پاکوخاوێنیو... هتد).

٥- گرنگیدان بە سیستەمی خوێندنو بنیاتنانەوەی نوێو دروستکردنی سیستەمێکی نایاب بۆ خوێندنو بەرزکردنەوەی ئاستی زانستو زانیاری.

٦- بڵاوکردنەوەی بەها بەرزەکان لەناو کۆمەڵگاداو دروستکردنی کۆمەڵگایەکی خاوەن پەیام.

٧- رێزگرتنی مافی مرۆڤو بڵاوکردنەوەی خۆشەویستیو رۆحی مرۆڤدۆستیو برایەتی.

٨- بنیاتنانی سیستەمێکی دادگەر لە حوکمرانیدا دور لە هەموو سیمایەکی توندو تیژیو دیکتاتۆریەتێك.

٩- دابینکردنی یەکسانیو دادگەری کۆمەڵایەتیو حوکمی یاسا.

١٠- کاریگەرکردنی رۆڵی حکومەتو وەزارەتو دەرچونیان لە شێوازی کلاسیکیو ناونانی کۆمەڵە وەزارەتێك کە لە دروستبوونی یەکەم وەزارەتەوە لەم وڵاتەدا گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە. بەڵکو پێویستە بەپێی پێویستییەکانی رۆژگار بێت، بۆ نموونە: لە حکومەتەکەی فرانسۆ میتراندا وەزیرێك دانراوە بەناوی «وەزیری کاتی بەفیڕۆچوو» بۆ ئەوەی خەڵکی فێری رێزگرتنی کاتو سودوەرگرتن لەکاتی بە فیڕۆچوو بکات!

١١- گرنگیدان بە لاوانو زیندووکردنەوەی ئینتیمایان بۆ وڵاتو دروستکردنی رۆحی ولاتپەروەریو دڵسۆزی بۆ نیشتمان، چونکە لاوان ئێستاو ئایندەی ئەم وڵاتەن.

بەهیوای پەرە پێدانو پێشکەوتنی ئەم وڵاتە ئازیزە.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەوەی سووربێت لەسەر سەرکەوتن و پلانی بۆ دابنێت، زۆر
نزیکە لە سەرکەوتنەوە! (ڕوترو)

ئەگەر بزانین چۆن شکستمان هێناوە، تێدەگەین چۆن
سەردەکەوین! هەمەنگوای

ساڵێک بیربکەرەوەو چرکەیەک بدوێ!
پەندێکی ژاپۆنی

ئەوانەی لە کاتی ڕۆیشتندا تەماشای دواوە دەکەن،
هەرگیز ناگەنە شوێنی مەبەست! پەندێکی چینی.

ئامانج و ئاواتە گەورەکان گەلێکی گەورە دروست
دەکەن! توماس فولەر

دەستووری ئاسمانە، خۆت بگۆڕە مێژوو دەگۆڕێت!
مالیک بن نەبی

ئەگەر ڕەوە ئاسکەکە یەکیان گرت، شێر لە برسا
خەوی لێ دەکەوێت! پەندێکی کینی

دەمپرسی بۆچی بە کارێک هەڵناسیت، دوایی بۆم
دەرکەوت کە منیش یەکێکم لەوان! نادیار

پێویستە فێربین بەیەکەوە بژین، یا وەک نەفامەکان
بەیەکەوە بمرین! مارتن لوسەر کینج

گەورەیی هەرگیز لەو کەسە نزیک نابێتەوە، کە
هەمیشە بۆ ژێر پێیەکانی دەڕوانێت! هیتۆ بادیسا

# بەرگێك بۆ دۆزینەوەی مرۆڤە ژیرەکان!!

## کارگێڕی بە چیرۆك



دەگێرنەوە لە دێر زەماندا، پاشایەك دەژیا، هێندە عاشقو شەیدای جلو بەرگی جوان بوو کە هەموو سەروەتو سامانەکەی سەرف دەکرد لە پێناو دەرکەوتنیدا بە جوانترین شێوەو لە نایابترین جلو بەرگدا!

هیچ گرنگی بەسەربازەکانی نەدەدا، ئاگای لەگوزەرانی گەلەکەی نەبوو، نەیدەزانی هەژارانی وڵاتەکەی چۆن ژیان بەسەر دەبەن، بێ ئاگا لە پلانو نەخشەی دوژمنان!

چێژی لە هیچ گەشتوگوزار، یاخود شانۆو دەقێکی ئەدەبی یا خوێندنەوەی کتێبێك وەرنەدەگرت، جگە لە چێژ وەرگرتن لە نمایشی جلو بەرگەکانو تەماشاکردنیان نەبێت.

هەر کاتژمێرەو جلێکی دەپۆشیو رۆژی چەندین جار خۆی دەگۆری!!

ئەو شارەی پاشای تێدا دەژیا شارێکی خۆشو دلگیر بوو، خەڵکی لەزۆر لاوە دەهاتنە سەردانی.

رۆژێك دوو کەسی دەستبرو ساختەچی هاتنە لای پاشاو خۆیان بە (تەونچی) ناساندو گوتیان: ئێمە دەتوانین نایابترین قوماش بۆ جەنابی پاشا برێسین کە هەرگیز بە خەیاڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتبێت!

ئەو نایابییەش تەنها لەبەر جوانیو رازاوەییو نەخشو نیگاری ئەو قوماشە نییە، بەڵکو ئەم جۆرە قوماشە لە جۆرە دەزوویەك دەرێسرێت کە سیفەتێکی زۆر سەیری هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەر کەسێك شایانی پلەو پایەی خۆی نەبێت هەست بە بوونی ئەو جلو بەرگە ناکاتو نایبینێت!؟

یاخود کەسێك کە نەزانو دەبەنگ بێت، بە هەمان شێوە ناتوانێت هەست بە بوونی ئەو جلو بەرگە بکاتو رێگای پێ نادرێت!

پاشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «بێگومان ئەم جلوبەرگە زۆر سەیرە، کاتێك لەبەری دەکەم، دەزانم کام لە پیاوانم بۆ پلەو پایەی خۆی گونجاوەو دەتوانم ژیرو نەفام لە یەکتر جودا بکەمەوە، کەواتە پێویستە یەکسەر دەست بە رستنی ئەم قوماشە بکرێت».

هەردوو کابرای دەستبر تەونی خۆیان داناو وایان پیشاندا کە خەریکی رستنی قوماشن، بەڵام هیچ تەزوویەکیان نەخستبووە سەر تەونەکەیان لەگەڵ ئەوەشدا بە هەموو چاو قایمییەکەوە فەرمانی دابینکردنی گرانبەهاترین جۆری ئاوریشمو سکەی ئاڵتونیان دەکردو دواتر لە باخەڵی خۆیانیان توند دەکردو لە کیسو تورەکەیان دەنا!

ئەوان رۆژانە تا درەنگانی شەو لەم کارەیان بەردەوام دەبوونو بەردەوام ئاوریشمو ئاڵتونیان داوا دەکرد!

دوای ماوەیەك پاشا گوتی: تۆ بڵێی چەندیان لە کارەکە ئەنجام دابێت؟ هاوکات هەستی بە ترسو نیگەرانی کرد کاتێك بیری کەوتەوە کە کەسانی دەبەنگو نانەجیبو نەشیاو ناتوانن ئەو قوماشە ببینن!؟

لەبەر ئەوە بریاریدا کە کەسێك بنێرێت بۆ بەسەرکردنەوەی پرۆژەکە.

دانیشتوانی شاریش هەموو هەواڵی ئەو هێزە ئەفسوناویەیان بیستبوو کە لەو قوماشەدایە، هەریەکەش چاوەروان بوو کە لە دراوسێکەی خۆیدا گێلیو نەفامیو ناشایستەیی بۆ دەر بکەوێت!

پاشا بریاری دا وەزیرە پیرەکەی دەستەراستی بنێرێت بۆ لای تەونچییەکان، چونکە ئەو باشترین کەسە کە بەو کارە هەڵسێت، چونکە کەسێکی زیرەكو بە ئەزموونەو کەس لەو شیاوتر نییە بۆ ئەو پلەیەی کە پێی دراوە.

پیرە وەزیری زیرەك گەیشتە ئەو هۆڵەی کە دوو کابرا فۆڵبرەکە لەسەر تەونێکی بەتاڵ خەریکی رستنی قوماشەکەی پاشان.

وەزیر کە چاوی پێیان کەوت لەدڵی خۆیدا گوتی: ئای خودایە، خۆ من هیچ نابینم، بەڵام ئەم قسەیەی لای کەس نەدرکاند!

تەونچییەکان وەزیریان بانگ کردو داوایان لێکرد کە رای خۆی دەربڕێت سەبارەت بەم قوماشە نایاب و قەشەنگ و بێ وێنەیە.

وەزیر چاوەکانی کردنەوە، بەڵام هیچی بەدی نەکرد، دووبارە لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە تۆ بڵێی من گێل و نەفام بم، پێشتر من وا لەخۆم حالی نەبووم، خۆ نابێت کەسیش بەمە بزانێت، ئەدی من شیاوی ئەو پلەو پایەیە نیم کە هەمە؟ نەخێر هەرگیز ناڵێم قوماشەکە نابینم!».

یەکێکیان بە وەزیری گوت: چییە گەورەم بۆ شتێك ناڵێیت؟

پیرە وەزیریش بە چاویلکەکانی روانیە تەونەکەو گوتی: زۆر جوان و نایابە، ئای چی نیگارسازیەکتان ئەنجامداوە، رەنگەکانی چەند جوانن! ئەم هەواڵەش بە جەنابی پاشا رادەگەیەنم و خۆشحالی خۆمی عەرز دەکەم.

هەردوو کابرای فۆڵبڕو ساختەچی خۆشحالی خۆیان بۆ قسەکانی وەزیر دەربڕی و دواتر دەستیان کرد بە وەسفی قوماشەکەو جۆری رەنگەکانی، تا وەزیر بە باشی لەبەری بکات و بۆ پاشای بگێڕێتەوە.

دوای ئەمە زیاتر داوای دابینکردنی پارەو ئاوریشم و ئاڵتونیان کرد بۆ بەردەوام بوونی پرۆژەکەو تەواوکردنی قوماشەکە، بێ ئەوەی داوە دەزوویەك لەسەر تەونەکە هەبێت! بەڵام لەسەر تەونە بەتاڵەکەیان بەردەوام بوون!

دواتر پاشا چەندین کەسی تری ناردو هەموویان وەکو وەزیری یەکەم گەڕانەوە! پاشان پاشا خۆی سەردانی پرۆژەکەی کردو ویستی بەچاوی خۆی بیبینێ.

پاشا: ئەوە چییە؟ من هیچ نابینم، چ کارەساتێکە؟ ئایا من گێل و نەفامم؟ ناشێم بۆ پاشایەتی و شایانی ئەم پلەو پایەیە نیم؟ ئەم قسەیەی تەنها لە دڵی خۆیدا گوت، بەڵام بەم شێوەیە بۆ دەوروبەر دوا:

« ئای کە چەند نایاب و قەشەنگە، بەڕاستی زۆرم بەدڵە!»

هەموو دەست و پێوەندەکان بێ ئەوەی هیچ ببینن بەیەك دەنگ لەدوای پاشاوە گوتیان: ئای کە نایاب و ناوازەیە!.

هەموو پاشایان ئامۆژگاری کرد کە بە زووترین کات ئەم جل و بەرگە لەبەر بکات و لە رێو رەسمی شاهانەی خۆیدا دەرکەوێت.

دەم بە دەم جوانی و ناوازەیی قوماشەکە دەگوازرایەوەو هەموو پێی دڵخۆش بوون، پاشاش بڕیاری دا هەردوو کابرا خەڵات بکات و سونبولی (سواری تەونچی) پێ بەخشین.

ئەو شەوە تا بەیانی (١٦) مۆمی شاهانە ژووری تەونچییەکانی رووناك دەکردەوەو لە هەوادا خەریکی برین و دوورینی جل و بەرگە نایابەکەی جەنابی پادشا بوون و لە کۆتاییدا گوتیان: جل و بەرگ ئامادەیە!

پاشا هاوڕێ بە دەست و پێوەند تەشریفیان هێنا، دوانەی فێڵبازیش دەستیان هەڵبڕیبوو وەکو ئەوەی کە شتێکیان هەڵگرتبێت و پاشان گوتیان: ئەوە جل و بەرگەکانەو هێندە سوکە وەکو دەزووی جالجاڵۆکە، بەشێوەیەك کە تۆ وا هەست دەکەیت هیچت لەبەر نەکردووە، ئەمەش لە خودی خۆیدا نهێنی جوانی ئەم بەرگانەیە، جا با شای شکۆدارمان جل و بەرگەکانی دابکەنێ و تا بتوانین لە بەرامبەر ئەم ئاوێنە گەورەیەدا جل و بەرگە نوێیەکانی لەبەر بکەین!!

پاشا جل و بەرگەکانی داکەند و دوانەی ساختەچیش وایان نیشاندا بەهەڵس و کەوتی تەمسیلیان کە بەرگە نوێیەکە دەکەنە بەر پاشاو پاشاش بەرامبەر ئاوێنەکە بە دەوری خۆیدا دەسورایەوە!

هەموو بە یەك دەنگ گوتیان: ماشەڵڵا بە راستی بەرگێکی بەهادارو نایابە! دەقاو دەق دەڵێی بۆ تۆ دوراوە! پاشا لە رێورەسمێکی شکۆدارداو لە نمایشێکی گەورەدا هاوڕێ بە سوپاو سەربازو پاسەوانی زۆر لە شەقامەکانی شاردا بەرگی نوێی نمایش دەکرد، خەڵکی هەموو بەسەر جل و بەرگەکانی پاشایاندا هەڵدەداو بە جوانترین شێوە وەسفیان دەکرد، کەس نەیدەویست کە کەس بزانێت هیچ نابینێت، چونکە دوایی بە کەسێکی گێل و نەفام لە قەڵەم دەدراو دەزانرا کە شیاوی شوێنی خۆی نییە!!

لە ناکاو منداڵێکی بچکۆلە هاتە قسە: (وەی خۆ پاشا هیچی لەبەردا نییە!!) لەو کاتەدا باوکی منداڵەکە گوتی: ئەی خوایە گیان، گوێ بگرن بۆ دەنگی ئەم منداڵە پاکە، یەکێکی تریش لە پەنای ئەودا بە چرپە بە هاوڕێکەی گوت: ئەوە منداڵێکەو دەڵێت پاشا هیچی لەبەردا نییە!

لە کۆتاییدا هەموو هاواریان کرد هیچی لەبەردا نییە!!

پاشا هەموو گیانی کەوتە لەرزین، بۆی دەرکەوت کە راست دەکەن، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: دەبێت نمایشەکە تەواوکەم، لەبەرئەوە بە لوتێکی بەرزترەوە درێژەی بە رۆیشتنداو دەست و پێوەندو نۆکەرەکانیشی کلکی عەبا درێژەکەیان لە هەوادا بۆ هەڵگرتبوو، کە ئەسڵەن وجودی نەبوو!!

لەم چیرۆکەوە زۆر شت فێردەبین، لەوانە:

١- هەندێجار فۆڵبوونەوە لە گەورەکردنی زات و گرنگیدان بە رووکەش لە سنوری خۆی دەردەچێت و لەسەر حیسابی مەسەلە گرنگەکان دەبێت زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنێت!

٢- پاشای وڵات نابێت خۆی بە کاری بچوکەوە خەریك بکات، سەرکردایەتی کردن تەنها لە دەرکەوتن لە جل و بەرگێکی جواندا ببینێتەوە!

٣- بە داخەوە هەندێکجار کەسێك لە ئێمە بە تەواوەتی خۆی ناناسێت و خۆی زۆر بەگەورەتر لەوە دەزانێت کە هەیە!

٤- جاری وا هەیە مرۆڤ بە قسەیەکی زۆر نا مەعقول فریو دەخوات، کە دەکرا بە کەمترین بیرکردنەوە پەردەی وەهمی لەسەر هەڵماڵرێت!

٥- زۆرجار قوربانییەکی زۆر بە ماڵ و سەروەت دەدرێت لە پێناو مەسەلەیەکی وەهمی و سەراب ئاسادا!

٦- نابێت مرۆڤ لە وتنی حەق بترسێت، چونکە دەرئەنجامی بێدەنگ بوون زۆر ترسناکترە لە وتنی حەق و ئاشکراکردنی!

٧- وتنی حەق کاری مرۆڤە ئازاکانەو بە هەموو کەس ناکرێت!

٨- مەرج نییە هەموو کات یەکدەنگی و هاوڕایی باش بێت، بە تایبەت کاتێك هەموو هاوڕان لەسەر شتێکی بەتاڵ و پروپوچ، چونکە هاودەنگی هەموو جیهان ناحەقێك ناکات بە حەق!

٩- دەبێت مرۆڤ متمانەی بە خودی خۆی هەبێت و خۆی باش بناسێت و ترسی لە قسەی خەڵك نەبێت!

١٠- نەنگییە بۆ مرۆڤ کوێرانە شوێنی قسەی خەڵك بکەوێت و عەقڵ و هۆش و هەستی خۆی لە کار بخات!

١١- نابێت مرۆڤ بێ ئاگایانە بژی بێ ئەوەی بزانێت چی لە دەوروبەریدا روودەدات و راستی مەسەلەکان چۆنن!

١٢- ئەگەر وریا نەبین زۆرجار کەسانی فۆڵبڕو ساختەچی بە بەرچاوی خۆمانەوە ماڵ و سەروەتمان بە تاڵان دەبەن و ئێمەش زەق زەق تەماشایان دەکەین!

١٣- دەبێت پاشای وڵات بزانێت لەسەرچی پێوەرێك هاوکارو راوێژکارانی هەڵدەبژێرێت و بزانێت کێ شایەنی چی پلەو پایەیەکە!

١٤- زۆرجار سەلامەتی هەڵدەبژێرین و سەری خۆمان کز دەکەین و لە ئاستی راستی چاومان دەنوقێنین.

بەڵام کورد وتەنی: ئەوەی بترسێ ناخەلەسێ و مەرج نییە هەموو کات سلامەت دەرچین!



و: مودریک عەلی عارف

# دەتەوێت کارمەندێکی سەرکەوتوو بیت؟

لەم سەردەمەدا کۆمەڵە کارمەندێکی زۆر دەبینین کە گلەیی و گازندەو سکاڵایان هەیە لە کارو پیشەو پەیوەندییان لەگەڵ هاوکارەکان و تەنانەت بەڕێوەبەرو سەرۆکەکەشیاندا، شوێن و ژینگەی پیشەو کارەکەیان بووەتە دۆزەخێکی پڕ لە بێزاری و دڵەڕاوکێ و ڕاڕایی و خۆمانە بڵێین: خۆیان داوەتە دەست قەدەرو ئاو.

لە خوارەوە چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو کە لە ڕێگەی ئەزموونەوە بەدەستم هێناون، بەو هیوایەی یارمەتی تۆی بەڕێز بدەن کە کارمەندێکی تازەکاریت، یاخود گلەیی و سکاڵات هەیە لە کارو پیشەو هاوکارو بەڕێوەبەرو سەرۆکەکەت:

١- کەسێتی و ڕۆحیەت و حاڵەتی دەروونی بەڕێوەبەرو سەرۆکەکەت بناسە:

ئەم خاڵە یەکێکە لەو شتانەی کە بە شێوەیەکی زۆر باش دەتوانێت یارمەتیدەرو هاوکارت بێت، تا بزانیت بەڕێوەبەر یا سەرۆکەکەت چ جۆرە کەسێکە؟ دواجار ئەو مرۆڤێکەو خاوەنی کەسێتی و ڕۆحییەی تایبەت بە خۆیەتی، ئەوە ئەرکی تۆیە کە بە شێوازە جیاوازەکان و پرسیارکردن لە کەسانی دیکە کەسێتی و ڕۆحییەت و حاڵەتەکانی ئەو بناسیت، بۆ نموونە: چ شتێك ئەو شادو خۆشحاڵ و ئارام و، چ شتێکیش ئەو تووڕەو بێتاقەت و بێزار دەکات؟

تۆی بەڕێز کە خوێنەری ئەم گۆڤارەیت بە دڵنیاییەوە تاوەکو ئێستا چەندین ڕێگەو شێوازی زۆرت بۆ چۆنییەتی ناسینی کەسێتی تاکەکان خوێندۆتەوەو فێر بوویت کە چۆن و بە چ شێوەیەك دەتوانرێت لە مرۆڤەکان نزیك ببیتەوەو کەسێتی و ڕۆحییەتیان بناسیت.

٢- ڕێز لەو کارمەندانە بگرە کە تەمەنیان لە تۆ زیاترە:

ڕێز لەو کارمەندانە بگرە کە تەمەنیان لە تۆ زیاترە، تەنانەت ئەگەر فەرمان و ئەرکێکیشت بدەن بەسەرداو ئەگەرچی پۆست و پلەو پایەکەشیان لە تۆ کەمتر بێت، تۆ دەتوانیت بە ئارامی و لەسەرخۆیی و بە وتنی ئەم ڕستەیە: "چونکە تۆ ئەزموونت لە من زیاترە" هەرگیز تەمەنی ئەو مەبەرە سەرەوەو تەنها باس لە ئەزموونی زیاتری ئەو بکە بە تایبەت ئەگەر ئافرەت بوو، لە کاتی پشووەکان و بێکاریدا داوای لێ بکە کە لە بارەی ئەزموونەکانییەوە قسەتان بۆ بکات، بەم شێوەیە ئیدی ئەو کەسە حاڵەتی فەرمان کردن و دەستووردان بەسەرتاندا لە دەست دەدات و لە ڕووی سۆزو میهرەبانییەوە مامەڵەو ڕەفتارتان لەگەڵدا دەکات.

٣- بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ عەیبەو کەم و کورتی کارمەندی پێشوو باس مەکە:

هەرگیز گلەیی و گازندە لە کارمەندی پێشوو مەکە، بەڵکو بە پێشنیارکردن بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو کارمەندە بخەرە ژێر پرسیارەوە، تاوەکو بەرپرسەکەت ئاگادار بێت لەوەی کە کارەکەی تۆ لە کارەکەی ئەو باشترە.

٤- تەنها سەرقاڵی کارەکەی خۆت بە:

کارت نەبێت بە ئیش و کاری خەڵکییەوە، چونکە لە شوێن و ژینگەی کارو پیشەکەتدا کەسانێك هەن کە دەیانەوێت تۆ بکەنە دەرەوەو بە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی نیشاندان زانیاری هەڵەت پێ بدەن بۆ ئەوەی زیانت پێ بگەیەنێت، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندیت لەگەڵ هەمووواندا باشە بەڵام زۆر مەبە بە دۆست و هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی، تاوەکو ئەو کەسە بە باشی بناسیت، ئەڵبەتە لەم کارو بیرکردنەوەیەشدا سەرکەوتنی سەد لەسەد بەدی نایەت، ئەزموون ئەوەی سەلماندووە کە لەوانەیە پاش دە ساڵ کارکردن لەگەڵ هاوکارێکدا ڕووبەڕووی چەندین گرفتی مەترسیدار ببیتەوە، چونکە کەسەکان بە سەرنجدان لە هەل و مەرج و بارودۆخەکان دەگۆڕدرێن و لە کاتی پێشکەوتنی تۆدا لەوانەیە هەر جۆرە کارێکی نابەجێ ئەنجام بدەن.

٥- بە باشترین شێوە ئەرك و کارەکانت ئەنجام بدە:

ئەو ئەرك و کارەی کە پێت دەسپێردرێ و دەبیتە بەرپرسی بە باشترین شێوەو بە تەواوی ئەنجامی بدە، چونکە تۆ مووچە بۆ ئەوە وەردەگریت کە ئەو ئەرك و کارەی کە پێت سپێردراوە ئەنجامی بدەیت، پێویستە کە ئەرك و کارەکەت بە باش و دروستی ئەنجام بدەیت و دەرەنجامێکی باش و خوازراوی هەبێت.

٦- ئاستی زانستیت بەرز بکەرەوە:

هەوڵ بدە زانیارییەکانت ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ببن، ئەم کارەش لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب و بەکارهێنانی ئینتەرنێت و یاخود هاونشینی لەگەڵ هاوکارەکانی دیکەو...هتد. بەدەست دێت.

دەتوانیت بە پرسیارکردن لە کارمەندانی بەشێکی دیکەی کۆمپانیاو فەرمانگەکەت زەمینەی زانیارییەکی نوێ بەدی بهێنیت و بە سوپاس و پێزانینێك کارەکەت ئەنجام بدەیت، ئەم کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ بەجێ نەمێنیت و دوا نەکەویت و سەرۆك و بەڕێوەبەری کۆمپانیاو فەرمانگەکەشت هیچ کاتێك تۆ لە دەست نەدات.

٧- بێجگە لە کارکردن لە کۆمپانیاو فەرمانگەکەدا پێویستیشت بە ئیسراحەت و پشوودان هەیە:

هەندێ کات داوات لێ دەکرێت کە لە ڕۆژی پشوودا بەهۆی زۆری ڕێژەی ئیش و کارەوە بێیتە سەر ئیش و کار، کە ئەڵبەتە جاری یەکەم لە شێوەی داخوازیدایەو لە کاتی قبوڵ کردنی ئەم داواکارییەدا بۆ جارەکانی داهاتوو وەك ئەرکێك وەردەگیرێت و لە کاتی قبوڵ نەکردنیدا بە کارمەندێکی باش هەژمار ناکرێیت.

لێرەدا پێویستە ئەم کارە بکەیت: کارەکە قبوڵ بکە، بەڵام بە ڕاشکاوانە ڕای بگەیەنە کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی ئیسراحەت و پشوودانی تۆیە، بەڵام حاڵەتی تایبەت قبوڵ دەکەم و لە بەرامبەردا مووچەوپارەی زیادەکاری دوو بەرامبەرم دەوێت.

بەم شێوەیە دڵنیابە کە لەکاتی ئامادەبوونت لە ڕۆژە پشووەکاندا بێجگە لە سوپاسکردنت بەڕێوەبەرو سەرۆکەکەت دەستخۆشانەو "ڕێزوسوپاس" ێکیشت بۆ لە پێش چاو دەگرێت، ئەگەر وانەکەیت و هەفتەیەك ئامادە نەبیت، ئەوا تۆ بە کارمەندێکی ڕێك و پێك و خۆشەویست دانانێت و هەژمارت ناکات.

سەرچاوە/ گۆڤاری: موفقیت. ژمارە (١٦٤).

بەشی دووەم

# دیاردەکانی جێهێشتنی کارگێڕی

م.هاژە شیروانی




لــە گرنگتریــن دیاردەکانــی جێهێشــتنی کارگێڕی ئەمانەن:-

١- نەهاتن (غیــاب): نەهاتن بە گرنگترین دیاردەکانی جێهێشــتنی کارگێــری دادەنرێت، لەوانە زۆر شێواز لە خۆ دەگرێتو لە هۆکارێك زیاتریــش دەبێتە هــۆی دروســت بوونی، لە زۆرترین هۆکارەکانی کە دەبێتە هۆی نەهاتنی فەرمانبــەر بریتــین لە: نەهاتنی بۆ شــوێنی کارەکەی، یا هاتنی تەنها بۆ واژۆ کردن لە سەر تۆمــاری ئامادەبوونو دەرچــوونو گەرانەوە لە رۆژی دوایدا، لەوانەشــە لە نووسینگەکەی بچێتە نووســینگەیەکی تر بــۆ بەرژەوەندی تایبەتی، لەگــەڵ بوونی زۆرێك لە کارو ئەرك کە بە سروشــتی پێویســتی بە دەرچوونە لە نووسینگەکەی بۆ نووسینگەیەکی تری هەمان فەرمانگە بە مەبەستی راپەراندنی کارەکەی.

لە هەموو ئەوانەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن دەبینین کە کاری پێویســت جێبەجێ نەکراوەو نەهاتنیشی بۆتە هۆی کەڵەکەبوونی کارەکان لــە ســەریەكو لــە ئەنجامیــدا پەیوەندییەکــی خراپ لە نێوان هاوڵاتیو ئەو فەرمانگەیە دروست دەبێت،و هاوڵاتی هەست دەکات کــە کــەس گرنگی بــە خزمەتکردنی نــادات، وردە وردە رقەبەرایەتــی لــە نێــوان ئەوانو فەرمانبەران سەر هەڵدەداتو وادەکات بە دوای هەموو شــێوازێکی یاساییو نایاسایی بگەرێت تا خزمەتە دیاریکراوەکەی پێشکەش بکرێــت تەنانــەت ئەگەر بوو بە هــۆی دانی بەرتیل یا پەنا بردنە بەر ناسیاوو هاوەڵانی تا دەگاتە بەرپرسی فەرمانگەی پەیوەندیدار.

لــە لایەکــی تــر نەهاتــن دەبێتــە هۆی زۆربوونی نەهاتن لــە بازنەیەکی داخراودا کە کۆتایی نایە، چونکە ئەو هاوڵاتییەی کە چەند جارێــك ســەردانی نووســینگەیەك دەکات کە فەرمانبەرەکەی نەهاتــووە لەوانەیە لە هەمان کاتدا خۆشی فەرمانبەر بێتو کەسانی تر کاریان بە نوسینگەکەی بکەوێت، بەم شێوەیە نەهاتنی فەرمانبەرێــك هۆکارێکە بۆ فەرمانبەری تر لە بازنەیەکی کۆتایی نەهاتوو.

لێــرەدا دەبینــین گەلێك هــۆکار هەن کە دەبێتە هۆی نەهاتنی فەرمانبەر گرنگترینیان نەبوونــی شــێوازەکانی گەیانــدن لــە کاتو شــوێنی دیاریکــراو، یــان تێکچوونــی بــاری تەندروستی فەرمانبەر یا یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی، یا نەهاتنی کتوپڕ بەهۆی کۆچی دوایی هاورێیەك یا ناســیاوێکی، یا پێویســتی بوون بە ســەردانی دەزگا فەرمییەکانو بازارو لقی دامــەزراوو کۆمەڵەکانــی بەرهەمهێنانو نەخۆشــخانەو قوتابخانــەو... هتــد، لــە دامەزراوەکانــی کــە کاتی دەوامــی فەرمیان لــە یــەك کاتدایــە وادەکات کــە فەرمانبەر نوســینگەکەی جێبهێڵــێ لە کاتی پێویســتی بوونی بەم دامەزراوانە.

٢- هەڵاوســانی کرێــکاری لــە دەزگــای کارگێــری/ زۆربوونی ژمــارەی کارمەندان لە کەرتی خزمەتگــوزاریو کارگێری گشــتی بە دیاردەیەکــی جیهانــی دادەنرێــت، هەروەك تێبینــی دەکرێت کە فەرمانگــە فەرمییەکان ســاڵ لە دوای ســاڵ توانســتی مرۆیــی زیاتر وەردەگرێــت، ئەمەش دەبێتە هــۆی گۆرینی بەرچاو لــە رۆڵی دەوڵەت لە کۆمەڵگاو فراوان بوونــی چوارچێوەی دەســت خســتنە کاریو زۆربوونــی داواکاری خزمەتگــوزاری لێــی بە ژمــارەو جــۆری زیاتر بۆ هەمــوو چینەکانی کۆمەڵگا بە بێ جیاوازی.

٣- فەرامۆشــکردنی پرۆگرامــی راهێنان/

لێرەدا قسەکردن لە سەر راهێنان هەردەبێ ئاماژە بێت بۆ فەرامۆشکردنی کە هۆکارێکە بۆ جێهێشتنی کارگێڕی،و لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە دەرەنجامەکانی، چونکە ئەو فەرمانبەرەی کە راهێنانی پێنەکراوە ناتوانێ بە باشی بە ئەرك و کاری خۆی هەستێت بە پێی پێویست کە لە دوایدا فاکتەرێکە لە فاکتەرەکانی جێهێشتنی کارگێری، یان دەرەنجامێکە لە دەرەنجامەکانی جێهێشتنی کارگێڕی ئەوەش بە دابەزینی ئاستی (اداء)ی کارگێڕی کە هۆکارەکەی دەگەرێتەوە بۆ پرۆگرامی راهێنانی کە بە باشی رێکخستن و جێبەجێکردنی بە بێ پلان دانان و دیراسەتکردن بۆ نەکراوەو بۆتە هۆی لە دەست دانی گرنگیەکەی و بەرزنەکردنەوەی ئاستی (اداء)کردنی.

هۆکارەکانی جێهێشتنی کارگێڕی:

ئەو هۆکارو ئاستەنگانەی کە رووبەرووی کارگێڕی دامەزراو، دەزگا، کۆمپانیا، رێکخراوەکان دەبنەوە بریتین لە:-

یەکەم/ گیروگرفتی کارگێڕی: لێرەدا کۆمەڵێك گیروگرفت هەن کە رێگرن لەبەردەم کارگێڕی و لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەریان دەخەین:

١- نەبوونی شێوازێکی کارگێڕی کە لە رێگایەوە مومارەسەی کارگێڕی بکرێت بە شێوەیەکی رێك و لە پێگە جۆراوجۆرەکان.

٢- نەبوونی رێنمایی کارگێڕی کە پاڵپشتە بۆ باش بەرێوەچوونی کارەکان بە رێك وپێکی و جێبەجێکردنی کارگێڕی بە شێوازێکی باشتر.

٣- نەبوونی چاودێری و بە دواداچونی بەرێوەچوونی کارەکان لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکان بە مەبەستی دڵنیابوون لە باشی اداء.

٤- نەبوونی پاداشتی مادی و مەعنەوی بۆ راپەراندنی کارەکان بە باشترین شێوە.

٥- نەبوونی پرۆگرامی کاری رێك وپێك بۆ جێبەجێکردنی کارەکان لە لایەن هەموو کارمەندەکان بە شێوەی هاریکاری.

٦- نەبوونی هەندێك ئیمکانیاتی ماددی پێویست کە لە ئەنجامیدا دیاردەی جێهێشتنی کارو نەهاتن لە زۆر لاوە سەرهەڵدەدات، تاوادەکات کە ئاستی توانستی کەم بێتەوە هەروەها دەبێتە هۆی پێش نەکەوتنی کارگێڕی بەرەو باشی.

دووەم/ گیروگرفتی رێکخستن: رێکخستن شێوازێکە لە شێوازەکانی جێبەجێکردنی پلان و هەردەبێ کارگێڕی هەڵسێ بە دانانی ئەو پلانە جا چ لە سەر ئاستی دامەزراو یا لە سەر ئاستی فەرمانگە بێت بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی دیاریکراو جا چ ئەو ئامانجە گشتی یا ستراتیژی بێت، پلانیش بە مانای دانانی پرۆگرامێکی دوورو درێژ بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە.

لێرەدا گرفتی رێکخستن تایبەتە بە دەست نیشان کردنی پسپۆرییەکان و دابەشکردنی بەرپرسیاریەتی و ئەرك و جێبەجێکردنی ئامانجی دارێژراو وەکو:-

١- نەبوونی پلانی رێك وپێك کە لە رێگایەوە بتوانین زۆرێك لە پرۆگرامە ئامانجدارەکانی کارگێڕی جێبەجێ بکەین.

٢- هەندێجار بەرهەڵستی لە نێوان مومارەسەی کارگێڕی و کارە سەرەکیەکەی فەرمانبەر یا بەرهەمهێنەر کە کاریگەری دەبێت لە سەر توانای (اداء) بە هۆی نا هەماهەنگی (عدم التنسيق)دا.

سێیەم/ گیروگرفتی کۆمەڵایەتی: زۆربەی تاکەکان و لە شوێنە جیاوازەکان مەیلیان بەلای بەرپرسی ئەم شوێنەیە لە راپەراندنی کارەکان و متمانە کردنە سەری ئەمەش یەکێك بوو لەو سیستەمە کۆنانەی کە سەرکەوتوو نەبوو لە کارگێڕیدا.

پشت بەستن بە کەسانی تر و تەمەڵی کردن لە راپەراندنی کاروباردا لەو شتانەیە کەبە ئاسانی ناتوانین لێی دەرباز بین و پێویستی بە ماوەیەکی باش هەیە بۆ ئاراستە کردن و رێ نیشاندانی بەردەوام و لەم گیروگرفتانەش ئەم چەند خاڵەی خوارەوە سەرهەڵدەدات:

١- کۆنترۆڵ کردنی دەزگای کارگێڕی لەلایەن یەك کەس.

٢- بەردەوام بوونی شێوازەکانی حوکم کردن و کۆنترۆڵکردنی حوکمی نووسینگە بیرۆکراتیەت و سەرۆکایەتی.

٣.متمانەو پشت بەستن بە کەسانی تر لە هەموو کارێك.

٤. بڵاوبوونەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی وەك (واستە کردن و خزمایەتی و بەرتیل و گەندەڵی کارگێڕی و دەسەڵات گرتنە دەستی یەك تاك یا کۆمەڵێك لەم فەرمانگەیە).

چوارەم/ گیروگرفتی یاسایی: دەبینین کۆمەڵێك گرفتی یاسایی هەن کە رێگرن لەبەردەم جێبەجێکردنی کارگێڕی بە شێوەیەکی گشتی لەمانەی خوارەوە خۆی دەگرێتەوە:-

١- نەبوونی رێکخستنێکی یاسایی لە شێوەی رێنمایی گشتی بۆ جێبەجێکردنی کارگێڕی.

٢- هەماهەنگی نەکردنی نێوان کارگێڕی و یاسایی خزمەتی گشتی، لەگەڵ تێبینی کردنی بوونی هەندێك رێسای خزمەتی دارێژراو بۆ ئەو کارە کە ناگونجێ لەگەڵ کارگێڕی وەکو (رێکخستنی کارەکان کە بۆ ئێستا بگونجێ، نەبوونی پاداشت کردن، سزادانی (تأديبى).

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

## بەشی چوارەم

بنەماکانی ڕێکخستن:

کاتێك قەبارەی ڕێکخراوەکان گەورە دەبن، کارەکان دەست بە ئاڵۆزی دەکەن، لێرەدا لە سەر بەڕێوەبەران و ڕێکخەران پێویستە کە هەڵسن بە بنیاتنانی هەرەمی ڕێکخستن و چالاکی ڕێکخستن کە بگونجێت لەگەڵ قەبارەی ڕێکخراو و بارودۆخە نوێیەکەی، دیزاین کردنی هەرەم و چالاکی ڕێکخستن بە شێوەیەکی گونجاو دەتوانێت یارمەتی ڕێکخراو بدات بۆ هەماهەنگی کارەکان لە نێوان یەکەکانی ڕێکخراو و بەرزکردنەوەی هەستی کرێکاران بۆ بەجێگەیاندنی کارەکانیان، بۆ ڕێکخراویش گەیشتن بە ئامانجەکەیەتی، لە کۆششی بەڕێوەبەران و ڕێکخەران بۆ بنیاتنانی هەرەم و چالاکی ڕێکخستن پێویستە کە متمانە بکاتە سەر کۆمەڵێك بنەمای ڕێکخستن کە یارمەتی بەڕێوەبەر و ڕێکخەران دەدات لە دیزاینێکی گونجاو بۆ هەرەم و چالاکییەکانی.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کە بنەماکانی ڕێکخستن بۆ خوێنەری بڕیاری ئازیز ڕوون بکەینەوە کە بریتین لە:-

یەکەم/ جیاکەرەوەی ڕێکخستن: بریتییە لەو هێزەی کە چالاکییەك لە یەکێکی تر جیادەکاتەوە، و لە یەکیان دوور دەخاتەوە لە یەکە جیاوازەکانی ڕێکخستن، لە ڕووی زمانەوانی بە واتای جیاوازی، پێك نەچوون، باشتربوون..... هتد دێت، لە ڕێکخستندا بە واتای بوونی جیاوازی لە نێوان یەکەکان تاوەکو جیاواز بێت یا بناسرێتەوە لە وانیتر، بە شێوەیەك کە ڕەنگدانەوەی سروشت و ئەدای کارە، یان بە گوێرەی پێشبینی کردنی بارودۆخ و ئەو پەرەپێدان و گیروگرفتانەی کە ڕووبەرووی ڕێکخراو دەبێتەوە بە پێویستی بوونی یەکەی نوێ و سەربەخۆ لە یەکتری، ئەمەش تاوەکو ئەدای هەریەکەیان دووربێت لە چوونە ناویەك و جیاوازبوون لەگەڵ یەکەکانی تر، کار بەم شێوەیە دەرئەنجامی ئەدایەکی باش بێت. لێرەدا سێ جۆر لە جیاکەرەوەی ڕێکخستن هەیە کە ئەوانیش:

١- جیاکەرەوەی ئاسۆیی Horizontal Differentiation:- ئاماژە دەکات بە لە یەککردنەوەی چالاکییەکان لە شێوەی یەکەکان کە لە یەکتری جیادەکرێنەوە بە شێوەی ئاسۆیی و لە هەمان ئاستی ڕێکخستن، مەرجەکانی جیاکەرەوەی ئاسۆیش بریتین لە:-

* سەرهەڵدانی پێویستی بۆ بوارێکی نوێ کە گوزارش لە چالاکیەکی سەربەخۆ یا پیشەیەکی دیاریکراو دەکات.
* قەبارەو گەورەیی و قورسی کارەکان تیایدا کە ڕێگە دەدات بە بوونی یەکەیەکی سەربەخۆ.
* کارمەندەکان لەم بوارەدا نوێن کە پێویستیان بە فێرکردن و مەشقکردنی دیاریکراو دەبێت.
* ئەم بوارە یان پیشەیە خاوەن ڕۆشنبیری و نەریتێکی دیاریکراوە.
* دەتوانین بۆ ئەم یەکە نوێیە بەرپرسیاریەتی و دەسەڵاتی سەربەخۆیی لە یەکەکانی تر پێبدرێت.
* دانانی ناوێك کە گوزارش لە ڕاستی و بابەتی ئەم بوارە نوێیە بکات لە یەکە نوێیەکەی ڕێکخستن.

لە پاڵ جیاکەرەوەی ئاسۆیی پێویستە ئاماژە بکرێت بە ( دابەشکردنی کار و پسپۆری، دابەشکردن بۆ کارگێڕییەکان، کە دابەشکردنی کارگێڕیش کۆمەڵێك ڕێگای هەیە کە بریتین لە دابەشکردن لە سەر بنەمای (پیشەیی، جوگرافی، کاڵا، بە گوێرەی کڕیاران، بە گوێرەی ئامێرەکان یا پرۆسەکان، ئەلف و بێ و ژمارەیی، کات، تێکەڵ، ماتریکس).

٢- جیاکەرەوەی ستوونی Vertical Differentiation:- ئاماژەدەکات بە قووڵایی ستوونی لە هەرەمی ڕێکخستن، بە شێوەیەکی باشتر ئاماژە دەکات بە ژمارەی ئاستەکانی ڕێکخستن لە یەکێك لە ڕێکخراوەکان یان لە بەشێکیدا (وەکو ژمارەی یەکەکانی ڕێکخستن لە یەکێك لە بەشەکان).

لێرەدا چوارچێوەی سەرپەرشتیکردن (Span of Control) هۆکارێکە بۆ سەرهەڵدانی جیاکەرەوەی ستوونی، بریتیشە لە ژمارەی ئەو کرێکارانەی کە یەك بەڕێوەبەر سەرپەرشتیان دەکات، ئەم بنەمایەش ئاماژەیە بۆ هەرەمی ڕێکخستن، بە تێبینی کردنی بوونی کۆمەڵێك فاکتەری دیاریکراو بۆ چوارچێوەی ڕێکخستن کە بریتین لە: ( ئاڵۆزی کارکردن، ئاستی لە یەکچوونی کارەکان، توانای بەڕێوەبەر، توانای بەردەستەکان، ئاستی دووبارەبوونەوەی کارکردن، جۆری کارەکە، فێرکردن، ئاستی ڕێکخستن).

٣- جیاکەرەوەی جوگرافی Geographical Differentiation:- بریتییە لە جیاکردنەوەی چالاکییەکان لە شێوەی یەکەی جیاکەرەوەو جیاوازی لە یەکتری لە لایەنی جوگرافییەوە، هەروەك بوونی نوسینگەی سەرەکی کۆمپانیایەك لە پایتەخت و کردنەوەی لقی تر لە شارەکانی تر.

# گەندەڵی!

ناوات جەمال

بە خستنەڕووی نووسینە ئابووری و کارگێڕییەکان چەندین پێناسە بۆ گەندەڵی هەیە، هەر یەکەو بە شێوازی جیاو بە جۆرێك پێناسەی دەکات، بەڵام سادەترین پێناسە بۆ گەندەڵی بریتییە لە: (خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتو پۆستی وەزیفەی حکومی بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسو سوودو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی پێش سوودو بەرژەوەندییە باڵاکانی گشتی دەخات)، بەم شێوازەی خوارەوە:

١- بەشداریکردنی زیاتر لە یەك کەسو لایەن لە گەندەڵیدا.

٢- ئەنجامدانی کاری گەندەڵی زۆر بە نهێنی.

٣- گەندەڵی بە دەستهێنانی سوودو بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان گەندەڵکارانە.

٤- گەندەڵی ڕێکەوتنێکە لە نێوان ویستی بڕیار بە دەست، لەگەڵ ئەوانەی پێویستیان بە بڕیارێکی دیاریکراو هەیە، کە خزمەتی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان دەکاتو بەس.

بەم شێوەیە دیاردەی گەندەڵی لە پشتی وتارێکی ئایدۆلۆجی ئاشکراوە ون دەبێ، کە بە ئاشکرا بەرگرییە لە بەرژەوەندی گشتیو سووربوونە لەسەر جێبەجێکردنی یاسا.

کەچی ڕاستییە شاراوەکەی گەورەکردنی دەستکەوتی تایبەتییە لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی بە پێشێلکردنی یاسا کار پێکراوەکانو شکاندنی ئەرکو بەرپرسیارێتی وەزیفی.

دیاردەی گەندەڵی دیاردەیەکی کۆنە لە وڵاتە دەوڵەمەندو هەژارەکاندا، بەهێزو بێ هێزەکاندا، پێشکەوتوو دواکەوتووەکاندا، بەڵام بەرێژەیەکی زۆر بەرچاو لەو وڵاتانەدا تەشەنەی سەندووە کە سیستەمی ئابووری و کارگێڕی و سیاسییان تا ڕادەیەك دواکەوتووو تووشی قەیران بوون، بۆیە تارادەیەکیش ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێبو نووسین لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی نوسراوەو پێشکەش بەم بوارە کراوە، لە گشت ناوەندە زانستیو ئەکادیمییەکاندا، بۆیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیشدا ڕێکخراوێك دامەزراوەو تایبەت کراوە بەم دیاردەیە، کاری ئەم ڕێکخراوە هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوەو دەستنیشانکردنی وڵاتانی گەندەڵ لە جیهانداو ڕیزکردنیان بەپێی ئاستو پلەی گەشەسەندنی گەندەڵی لە وڵاتاندا، بۆیە ئەم دیاردەیە تەنها یەك بواری ژیان ناگرێتەوە بەڵکو خۆی خزاندۆتە نێوان تەواوی کایەکانی ژیانو گشت بوارەکانی گرتۆتەوە، کە ئەمەش دیاردەیەکی مەترسیدارە کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دواکەوتنو لە ناوچوونو لێك هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم داموودەزگاکانی وڵات، کە دەبێتە هۆی بێزاریو نارەزایی هاوڵاتیانو نەبوونی متمانە لە نێوان دەسەڵاتو خەڵکدا.

## خەندەی کارگێڕی

## خوازبێنی

باوك بە کوری وت:
کورم دەمەوێ هاوسەرگیری بکەی لەگەڵ ئەو کچەی بۆم هەڵبژاردووی.

کور: بەڵام من خۆم هاوسەرم هەڵدەبژێرم...

باوك: بەڵام من کچەکەی جەنابی (بیل گیتس)م بۆ هەڵبژاردووی.

کور:... زۆ چاکە... مادام وایە من ڕازیم...

باوکی کور گفتوگۆی لەگەڵ (بیل گیتس) کردو پێی وت: هاتوم بۆ خوازبێنی کچەکەت،

بیل گیتس: بەڵام کچەکەی من هێشتا منداڵەو تەمەنی هاوسەرگیری نییە.

باوکی کورەکە: بەڵام زاوا جێگری سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتییە..

بیل گیتس: ئاە ... ئاوا ... کەواتە من ڕازیم...

باوك بە بەڕێوەبەری بانکی نێودەوڵەتی وت: گەنجێکمان هەیە زۆر گونجاوە بۆ پۆستی جێگری سەرۆکی بانکەکەتان...

بەڕێوەبەر: بەڵام ئێمە ژمارەیەکی زۆرمان لە جێگر هەیە، هیچ پۆستێکی بەتاڵمان نییە...

باوك: بەڵام جێگری سەرۆکی پێشنیارکراو مێردی کچەکەی جەنابی (بیل گیتس)ە.

بەڕێوەبەر: ئاە ... ئاوا ... ئەوا بڕیاری دامەزراندنیمان دا...

ئایا دەتوانیت کارەکانت بەم ڕێگایە بەڕێوەبەری؟



# چاودێری چییە؟

وەهاب حسێن محەمەد

١- چاودێـــری وەزیفەیەکـــی گرنگـــە، ڕەگەزێکی بنەڕەتییە لەو ڕەگەزانەی پرۆسەی بەڕێوەبردنـــی لێ پێکدێت. کـــە بریتییە لە: (نەخشـــەدانان، ڕێکخســـتن، ئاراســـتەکردن، چاودێـــری) بە واتـــای: چاودێـــری کردنێکی بەردەوامـــی نواندنـــی کارمەنـــدان لەمیانەی جێبەجێکردنیـــان لـــە ژێـــر ڕێنمایـــی پلانی دانـــراوداو هەڵســـەنگاندنی کارەکانیـــان یەك بەدوای ئەوی تردا.

مەبەســـت لەم پرۆســـەیەش دڵنیا بوونە لـــە بەجێهێنانـــی ئامانجـــە دیاریکراوەکانـــی ڕێکخراوەکە بەباشترین شێوە.

چاودێری پرۆســـەیەکی گشتگیرە: بەسەر هـــە مـــوو بەشـــەکانی ڕێکخراوەکـــەدا پیادە دەکرێـــت لەوانـــە کارمەنـــدان، ئامـــرازەکان، کاڵاکان، ســـەرمایەو شـــێوازی جێبەجێکردنی کارەکان.

ئەمڕۆش مانای تێگەیشـــتن لە چاودێری لـــەوەی تەنهـــا وەزیفەیەکی چاکســـازی بێت (ئامانجـــی تەنها چاکســـازی کەموکورتییەکان بێت) فراوانتر بووە بۆ کارێکی دینامیکی جوڵاو لەوانە لایەنەکانی چاودێریو سەرپەرشتیاری، پێوانەیـــی نواندن (قیـــاس الاداء)، چاودێری: کارکردنە بۆدورکەوتنەوەی هەڵە لە سەرەتاوە یـــان ئاشـــکراکردنی پێـــش ڕودانـــی یاخـــود توندکردنەوەی کەموکورتیەکانە لەســـەرەتای سەرهەڵدانیەوە (بەلایەنی کەمەوە).

٢- چاودێـــری تێکوشـــانێکی ڕێکخـــراوە لایەنێکی بەرپرس پێی هەڵدەستێت بریتییە لە: چاودێریکردنێکی بەردەوامی بەجێهێنانو پێوانەیـــی نواندنـــی ئەنجامـــە کردارییەکان، ســـەرەتا بەراوردیان بە پێوانە دانراوەکان بە مەبەستی دیاریکردنی لادانەکان (الإنحرافات) لـــە ئـــەو پێوانانـــەو هۆکارەکانـــی، پاشـــان دیاریکردنی گونجاوترین شـــێوازی چارەســـەر یـــان راســـتکردنەوەی کە بەدی دێـــت بەهۆی بەکارهێنانی باشـــترین سەرچاوەکانی (مادیو مرۆیی) بەردەســـت بەمەبەســـتی ڕێکخستنی ئامانجەکانو بەدیهێنانیان...

٣- کردارێکە بەڕێوەبەرایەتی وایدەبینێت ئـــەوەی ڕوویـــداوە پێویســـت بـــوو ڕوویدات؟ ئەگەرپێوست نەبوو ڕوویدات، کەواتە پێویستە چاکسازی تێدا بکرێت...

٤- توانایەکی بەڕێوەبردنە بەکاردەهێنرێت بەمەبەستی دڵنیایی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لە بەکارهێنانی ســـەرچاوەکان (ســـەرچاوەی مرۆیـــیو مـــادی)و بەدیهێنانـــی ئامانجەکان (ئامانجی ڕێکخراوەکە، دامەزراوەکە).

هەنگاوەپراکتیکیەکانی چاودێری:

١- دانانی پێوانەکان.

٢- تۆمارکردنی جیاوازیەکان، هەڵسەنگاندنو بەراوردکردنیان.

٣- راستکردنەوەی لادانەکان.

بنەماکانی یاساکانی چاودێری:

کۆمەڵێك بنەما یاخود یاســـا هەن دەبێت شـــێوازی چاودێری جەختیان لەسەربکاتەوە لەکاتی جێبەجێکردندا، بۆئەوەی ســـەرکەوتن یاوەری چاودێریو هەنگاوەکانی بێت.

١- بنەمای ئابوری: ئەو دەســـتهاتانەی لە پەیرەوکردنی ئەم شـــێوازەوە دەست دەکەوێت زۆرتر بێت لە تێچوونی تا ببێت بە بەهانەیەك بـــۆ بەردەوامی یان بۆ بوونی ئەم سیســـتەمە (مەبەست لەتێچونی کاروپرۆژەکانە).

٢- توندکردنەوەی خاڵە ســـتراتیژییەکانی چاودێری: چاودێرییەکی کاریگەرجێ پەنجەی دیارە بە هەمـــوو چالاکیەکانی ڕێکخراوەکەوە بەگشـــتی، هەروەها جەختکردنەوە لەو خاڵە پەنگخواردوانـــەی بـــە گشـــتی دەبنـــە لادانی نائاســـایی. بەڵام پێویســـت بـــە چاودێری ئەو لادانە ئاساییانە ناکات کە گرنگییەکی ئەوتۆیان نییەو شوێنەواری سلبی بە جێ ناهێڵن لەسەر ئاستی ئامانجە دانراوەکان.

٣- بنەمای گشتگیری: چاودێری دەبێت گشتگیربێتو هەموو چالاکیو بەرئەنجامە گرنگەکان بگرێتەوە، ئەوانەی هەست پێکراون یاخود بەرهەست نین کە شوێنەواری گرنگ بەسەر بەرئەنجامەکانی ڕێکخراوەکەوە بە جێدەهێڵن، چاودێری پێش کارکردن، لەکاتی کاردا، هەروەها دوای تەواوکردنی کار ئەنجام دەدرێت.

٤- بنەمای (یاسای) ڕوونو ئاسان: واتە چاودێری کاریگەر دەبێت تایبەتمەند بێت بە ڕوونی، ئاشکرایی تاوەکو ئەوانەی جێبەجێکارین بتوانن لێی تێبگەین، بزانرێت کێ بەرپرسی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانە، لێپرسراوی جێبەجێکاران کێیە؟ هەروەها ئاسانکاری لەنەخشەکێشاندا، خستنەرووی داتاکان، دیاریکردنی بەرپرسیاری.

نابێت ئامرازەکانی چاودێری ئاڵۆزو پێکاچووبن، گوتەو واتاکانی چاودێری زیاد لە واتایەکیان هەبێت تاوەکو نەبێتە هۆی جیاوازی لە بۆچوونو واتادا، لە کۆتاییدا پەنهانی لەکارەکاندا دروست ببێت.

٥- سیستەمی چاودێری کاریگەر: ئەو شێوازە کاریگەرەیە هەمیشە چاوی لەسەرداهاتووە تاوەکو ڕابردوو، ئەمەش لەمیانەی جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەوە دەبێت.

أ- بایەخدان بە پێشبینی لادانەکان پێش ڕوودانیان، زیاد لەوەی گرنگی بدرێت بە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان (خۆپاراستن لە چارەسەرکردن باشترە).

ب- گرنگیدان بە ڕاستکردنەوەی هەڵەکان تا واژۆکردنی سزاکان بە تەنها.

ج- بایەخدان بە ئاراستەکانی داهاتوو، لە جەختکردنەوەی ئێستاو داهاتوو.

د- گرنگیدان بە بەدیهێنانی ئامانجەکان زیاتر لەچاودێری کردنی تاکەکان..

٦- بنەمای گونجاو، شیاو: واتە شێوازی چاودێری وێنەیەکی پێچەوانەی چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە بێت، گونجاوبێت لەگەڵ شێوازی ڕێکخستنو ئامانجەکانی (ڕێکخراوەکە، دامەزراوەکە)داو جەختکردنەوە لەسەر نەبوونی شێوازێکی باوی چاودێری شیاو بۆ ڕێکخراو چالاکییەکانیان. بەڵام شێوازی چاودێری دەگۆڕێت بە گۆڕانی جۆری ڕێکخراوەکە، قۆناغەکانی گەشەکردن، ئەو باردۆخەی ڕێکخراوەکە تیایدا نەشونماو گەشە دەکات.

٧- بنەمای لێهاتوویی: شێوازی چاودێری دەبێت ئەنجامەکانی بە دەست بهێنێت بە کەمترین ئەرکو ماندبوونو تێچوون.

جۆرەکانی چاودێری:

١- چاودێری ڕاستەوخۆ: جۆرێکە لە چاودێری هاوکاتی جێبەجێکردنی کردارەکانە چاوەڕوانی (لادانی) دیاریکراو دەکرێت بەدواداچوونی باشی بۆ دەکرێت لە کاتی گونجاودا، پێش تەواوبوونی ئەنجامەکان، دوای جێبەجێکردنی کارەکان بەمەبەستی ڕاستکردنەوەی لادانەکان (الإنحرافات).

٢- چاودێری ئیداری: حکومەت بەم کارە هەڵدەستێت، واتە ئەندامانی ئیدارەی گشتی بۆ دڵنیابوون لە چالاکییە جیاوازەکان، گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکان لە لایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە (السلطة التشريعية) هەروەها دڵنیابووون لە ڕایکردنی ئامانجەکان واتە ئامانجە یاساییەکان، هاوکات چاودێری کارگێری پشت دەبەستێت بە کۆمەڵێك هۆکار لەوانە: ڕاپۆرت، پشکنین، پیاداچوونەوە، بەدواداچون.

٣-چاودێری پێش وەخت: پێش بەجێهێانی ئامانجەکان دەکەوێت، یەکێکە لەکاریگەرترین شێوازەکانی چاودێری بۆ دەست بەسەراگرتنی تێچون.

٤- چاودێری خۆیی: پیاداچونەوەی تاکە بە خۆیو هەڵسەنگاندنی کردارەکانی بە مەبەستی ڕاستکردنەوەی ڕەوشتو هەڵسوکەوتی پێش جێبەجێکردنی کارەکانو ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی پیادەی کردووە، هاوکات چاودێرییەکی خۆپاراستنو چارەسەریانەیە لەهەمان کاتدا.

٥- چاودێری هەنگاو بە هەنگاو: لەم جۆرە چاودێریکردنەدا جێبەجێکردنی پلانەکە دابەش دەکرێت بەچەند قۆناغێکەوە دوای تەواوبونی هەر قۆناغێك کاری جێبەجێکراو بەراورد دەکرێت بەو پێوانانەی پێشتر دەستنیشان کراوە یاخود کاری لەسەرکراوە، پاش تەواوبونی هەر قۆناغێك، هەنگاو نانرێت بۆ قۆناغی داهاتوو ئەگەر دڵنیا نەبن لەوەی قۆناغی ڕابردوو بەشێوەی خوازراو تەواو نەبووبێت.

٦- چا ودێری بەجیا: یەکەم کەس ئاماژەی بەم دەستەواژەیە کرد -فردریك تایلور- بوو لە کتێبی {shop management} ئیدارەی کارگە، واتا بەڕێوەبەر یان کەسی بڕیار بە دەست نابێت زۆربەی کاتەکانی بە چاودێری کاری ڕۆتینی فەرمانبەران بگوزەرێنی، بەڵام دەبێت تەنها کاتەکانی بەچاودێری کارە إستثنائیەکان تەواو بکات واتە پێدانی ئیدارە بەو زانیاریيانەی تایبەتن بە لادانەکان پلانی دیاریکراو وەك بناغەیەك بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، ئەم شێوازە پشت دەبەستێت بەو ڕاپۆرتانەی بۆ بەڕێوبەرایەتی بەرزدەکرێنەوە دەربارەی (ئەوەی تەواوکراوە، ئەوەی دەبوو تەواوبکرێت). مەبەست لە چاودێری بەجیا ساناکردنی خودی کاروبارە کارگێڕییەکانە، تاوەکو بەڕێوەبەر بتوانێت ئاگاداری ئەو مەسەلانە بێت کە جێگای بایەخن، دورکەوێتەوە لەو کێشانەی کارمەندەکان لە توانایاندا هەیە چارەسەری بکەن.

کێن ئەوانەی بەکاری چاودێری هەڵدەستن:

بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاری چاودێری پیادەی دەکات، لە ڕێگای دەزگا تایبەتییەکانی دەوڵەت، کارەکانیان بریتییە لە چاودێری دەزگا جۆراوجۆرەکان. ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان، هەڵسەنگاندنی لادانەکانیان، لێپێچینەوەی بەرپرسان لە هەڵەو لادانەکان. گرنگترین دەزگا کە کاری چاودێری پیادە دەکات لەئاستی وڵاتدا دەزگای چاودێری یاخود دەزگای ناوەندێتی چاودێرییە (دەزگای چاودێری ناوەندی)، سەرەرای هەر وەزارەتێك یان ڕێکخراوێك چاودێری داراییو کارگێری خۆی دەکات، بەڵام لە کەرتی کاردا کاری چاودێری بەڕێوەبەر یان جێگرەکانی پیادەی دەکەن لە ڕێگەی پێکهێنانی لیژنە، یاخود دروستکردنی دەزگای لێپێچینەوەو بەدواداچون بۆ هەموو چالاکییە داراییو کارگێرییەکان. چەندجۆرێکی تری چاودێری هەن لەوانە چاودێری ڕامیاری (پەرلەمان)وە حزبە سیاسیەکانو چاودێری دادوەری ........هتد.

## ئاگاداربە پەشیمانی لە دوایە:

- قسەی زیاد بەبێ سوود.
- خەرجکردنی زیادو بێ جێ.
- درکاندنی نهێنییەکانت.
- متمانەدان بە هەموو کەس.
- تورەبوونی بێ هۆ.
- نە ناسینی دۆستو ناحەز.
- بە فیرۆدانی کات.
- سەرەڕۆیی لە تاواندا.



# ئاسانترین ڕێگە بۆ پاشەکەوتکردنی مووچەکەت!

دلشاد محمد

بەهۆی بەشداریی و هاوبەشیکردنم لە هەندێك لە یانە زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و ڕۆشنبیری و پەروەردەییەکانی سەر تۆڕی ئینتەرنێت ناسراو بە (تۆڕی جاڵجاڵۆکەی جیهانی) هەندێك جار لە ڕێی ئیمەیلەکەمەوە بابەتی هەمەرەنگ و سەرنجڕاکێش و بەچێژی وەهام پێدەگات، کە مایەی خوێندنەوەو تێرامان و بگرە وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەو ناردنییەتی بۆ دۆست و هاوڕێیان، چونکە سوودو کەڵکی زۆریان تێدایە.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت بیخەمە بەر دیدەی ئێوەی خوێنەرانی زێدە ئازیزو خۆشەویستی گۆڤاری (بڕیار) یەکێکە لەو نامانە کە خۆی لە دوو بەسەرهاتی واقیعیدا دەبینێتەوە، سەبارەت بەوەی مرۆڤ چۆن بتوانێت پارێزگاریی لە مانەوەی پارەو مووچەکەی بکات و سەرجەم پێداویستییەکانی ژیانی خۆی و خێزانی پێ دابین بکات و بەدڵخۆشی و کامەرانی ژیان بگوزەرێنێت و تا سەری مانگ پارەی پێ بمێنێت و نەکەوێتە ژێرباری قەرزەوە، لە کاتێکدا ئێمە زۆربەمان لەم وڵاتەدا مووچەکەمان بەشی تا نیوەی مانگ ناکات و هەر زوو ئیفلاس دەکەین و گیرفانمان خاڵی دەبێت!!

با بچینە سەر کرۆکی باسەکەو ئێوەش تا کۆتایی هاوڕێم بن و لە خوێندنەوەی بەردەوام بن:

کارێکی زۆر سادەو ئاسان هەیە، هەر کەسێك ئەنجامی بدات، بە ویستی خودا ژیان و گوزەرانێکی باشتر و خۆشتری بۆ دەستەبەر دەبێت و لەدونیادا پیت و بەرەکەت بەسەر ماڵ و سامانیدا دەڕژێت و لە دواڕۆژیشدا سەرفرازو سەربەرز دەبێت، ئەو کارەش بریتییە لە خێرو خێرات و بەخشین..!! چۆن؟؟

هێمن فەرمانبەرەو مووچەی مانگانەی (٥٠٠) هەزار دینارە، بەڵام بەدەست بێ پارەیی و بێدەرامەتی و گرفتی دارایی و قەرزەوە دەناڵێنێت... ئەو دەڵێت: پێم وابوو تا مردن هەر بەو حاڵە دەمێنمەوەو باروگوزەرانم بەهیچ شێوەیەك گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەوەی زۆریشی لێ دەترسام ئەوەبوو بمرم و ئەو هەموو قەرزو قۆڵەیەم لەسەر بێت کە لە باتی ئەوەی کەم بکات ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد.. بە هەرحاڵ ئیدی ئەوە پێویستیی ژیان و ماڵداریی و خێزانداریە، ئەگەرچی زۆر خۆشحاڵ و ئاسوودەو کامەرانم لەگەڵ خێزانەکەمداو زۆر ڕەچاوی باردۆخ و گوزەرانم دەکات، بەڵام ئەو هەموو قەرزە زۆرە دەستی ناوەتە قوڕقوڕاگەمان و ژیانی لێتاڵ کردووین...

هێمن دەڵێت: ڕۆژێك وەك هەموو جارێکی تر، چوومە دەرەوە بۆ پشوودان، سکاڵای حاڵی خۆم بردە لای دۆستێکم کە متمانەی زۆرم هەبوو بە ڕاوبۆچوونەکانی و قسەکانیم بەهەند وەردەگرت، ئامۆژگاری کردم کە مانگانە بڕێك لە مووچەکەم بکەم بەخێرو بیبەخشم.. منیش پێم وت: هیچم هەیە بیخۆم تا خێر بکەم؟!

کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بەسەرهاتەکەم بۆ خێزانەکەم گێڕایەوە، ئەویش وتی: تاقی بکەرەوە، ڕەنگە خودا دەرگای خێرمان لێبکاتەوە.. منیش وتم: کەواتە لەمەودوا هەموو مانگێك (٥٠) هەزار دینار لە مووچەکەم دەبەخشم و دەیکەم بەخێر. ئەو دەڵێت: سوێند بەخوا دوای ئەوە هەستم بەگۆڕان کرد لە ژیانمدا، ئیدی سەرباری قەرزداریش بوومە کەسێکی گەشبین و شادمان و دەستکراوە، مووچەکەم دابەشکردو خێرو بەرەکەتێك ڕووی تێکردم کە پێشتر شتی وەهام نەدیبوو، دوای دوو مانگ ژیان و کاروباری خۆم بەشێوەیەك ڕێکخست، کە دەمزانی کەی قەرزەکانم تەواو دەبن، بە فەزڵی خودا... پاش ماوەیەك خزمێکم دەستیدایە پشکداری و کاروباری خانووبەرەو منیش بەشدارو هاوبەشم بۆ پەیدادەکرد، هەرکات دەچوومە لای هاوبەشێك کەسێکی تریشی نیشاندەدام، ئیدی سوپاس بۆ خودا وام لێهات هەستم کرد خەریکە قەرزەکانم لەکۆڵ دەبێتەوە، منیش لەئاکامی هەوڵ و تەقالامدا هەر پارەیەکم دەستبکەوتایە بەشێکیم دەکرد بە خێر.

کەس تام و چێژی خێرو بەخشین ناکاو نازانێ تەنها ئەو کەسە نەبێ کە تاقیکردۆتەوە، تۆش ئارامبگرەو خێربکەو ببەخشە، ئەوکات خێروبەرەکەتی خودات چنگ دەکەوێت.

★ باوکی سارا، ئەندازیارێکی میکانیکییەو مووچەی مانگانەی یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار دینارە، بەڵام سەرباری ئەوەی مووچەکەی زۆرەو خانووی خۆی هەیە، مووچەکەی زۆر بەخێرایی تەواو دەبێ و خۆشی نازانێت کە چی لێدێت، ئەو دەڵێت: نازانم ئەو مووچەیەم چی لێدێ و چۆن سەرف دەبێت، هەموو مانگێك دەڵێم ئێستا دەست دەکەم بە دابینکردنی پێداویستییەکانم و خستنەگەری پارەکە، بەڵام سەیرەکەم هیچی نەماوەو تەواوبووە... تا ئەو کاتەی هاوڕێیەکم، ئامۆژگاری کردم کە مانگانە بڕێکی کەم لە مووچەکەم تەرخان بکەم بۆ یارمەتی دانی هەژارو کەم دەرامەتەکان، منیش مانگانە بڕی (١٠٠) هەزارم تەرخان دەکرد بۆ ئەو مەبەستە، ئەوەی جێگەی تێرامان بوو، لە یەکەم مانگدا بڕی (٣٠٠) هەزار دینار لە مووچەکەم مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێداویستی و خەرجی و مەسرەفەکانم وەك پێشتر بوون و هیچ گۆڕانیان بەسەردا نەهاتبوو.

باوکی سارا بە ڕاشکاوانە دەڵێت: من زۆر دڵخۆش و شادمان بووم و بڕیارمدا لەمەودوا لەباتی (١٠٠) هەزار (١٥٠) هەزار دینار بکەم بە خێر، پاش تێپەڕبوونی (٥) مانگ هەواڵیان پێدام کە مووچەکەم زیاد دەکرێت.. ئیدی بە فەزڵی خوداو پاشان بەهۆی خێرو بەخشینەوە هەستم دەکرد پیت و بەرەکەت بەسەر ماڵ و سامان و سەرجەم کاروبارەکانمدا دادەبارێت.

خوێنەری ئازیز، تۆش تاقی بکەرەوەو مانگانە بڕێکی پارەو مووچەکەت بکە بەخێرو بیبەخشە، دڵنیابە پیت و بەرەکەتی خودا بەسەر ماڵ و سامانی تۆشدا دەبارێ و لە نەهامەتی و کوێرەوەری و قەرزداری و بێدەرامەتی ڕزگارت دەبێ و سوود لە پارەو مووچەکەشت دەبینی!!

سکرتاریەت



ئا: عومەر عەبدولقادر

# پێشوازیکردنی میوان و ڕێکخستنی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەردا ١/٢

پرۆسەی ڕێکخستنی کاتی دیاریکراوو چاوپێکەوتنەکان لە بەرپرسیارێتییە گرنگەکانی سکرتێرەو پێویستە بە لێهاتوویی و کارامەییەوە ئەم بەرپرسیارێتییە جێبەجێ بکات. لە کاتێکدا بەڕێوەبەر بەرنامەیەکی ڕێکوپێك و گشتگیر دادەنێت بۆ ڕێنوێنیکردن، پێویستە سکرتێر پابەندبێت پێوەی لە کاتی دیاریکردنی مەوعیدەکان و ڕێکخستنی خشتەی چاوپێکەوتنەکاندا.

سکرتێر هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی هەموو ئەو ڕێوشوێنانەی کە پەیوەستن بە ڕێکخستنی مەوعیدەکانی بەڕێوەبەرو چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ کەسانی ناوخۆو دەرەوەی دامەزراوەکەو ئەمەش بەدیاریکردنی ئەو کەسانە دەست پێدەکات کە مۆڵەت دەدرێن بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەرو پاشان دیاریکردنی کات و شوێنی چاوپێکەوتنەکان.

سەرکەوتوویی سکرتێر بەوە هەڵدەسەنگێنرێت کە تا چەند بەتواناو کارایە لە دیاریکردن و ڕێکخستنی خشتەی مەوعیدەکانی بەڕێوەبەرو هەڵوەشاندنەوەی ئەو مەوعیدانەی کە بارودۆخەکە وا دەخوازێت هەڵبوەشێنرێنەوە، لە کاتی بوونی هەر هەڵوێستێکی نەشیاوو نائاساییدا بەباشی و بەجوانی هەڵسوکەوت بکرێت، بەوەی مۆڵەت بدرێت بە بەڕێوەبەر تا بە باشترین شێوە سود لە کاتەکانی کارکردنی وەربگرێت و هاوکێشە قورسەکە بەدیبێنێت لە ڕەخساندنی کاتی گونجاو بۆ میوان و کڕیاران و بەرپرسان و هاوڕێیان بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەرو لە هەمان کاتدا کورتکردنەوەی مەوعیدەکان و چاوپێکەوتنی ئەو کەسانە تاوەکو بەڕێوەبەر کاتی گونجاوی بۆ برەخسێت بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بە تایبەت لە بواری بڕیارداندا.

★ هەندێ بنەمای زانستی:

تێگەیشتنی ئەو خواست و ئارەزووانەی بەڕێوەبەر کە پەیوەستن بە دانانی خشتەی مەوعید و چاوپێکەوتنەکان کاری سەرەکی هەر سکرتێرێکە لە سەرەتای کارکردنی لەگەڵ هەر بەڕێوەبەرێکدا، بۆ ئەمەش پێویستە سکرتێر لەم کاروبارانەی خوارەوە شارەزابێت:

- دەبێت مەوعیدەکان لە چ کاتێکی ڕۆژەکەدا دابنرێن؟

- ئەو ماوەو کاتە چەندە کە بۆ هەر چاوپێکەوتنێك تەرخان دەکرێت؟

- ئەو مەوعیدانە کامانەن کە یەکەمینیان پێدەدرێت و لە پێش مەوعیدەکانی تر دادەنرێن؟

- لە حاڵەتی ڕەتکردنەوەی مەوعیدێك دەبێت بە چ شێوازێك هەڵسوکەوت بکرێت و چۆن قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکرێت کە سوورە لەسەر بەدەستهێنانی ئەو مەوعیدە؟

- چۆن بەڕێوەبەر لە هاتن و گەیشتنی میوان ئاگاداردەکرێتەوە؟

- ئەو ڕێوشوێنانە چین کە لە کاتی پێشکەشکردنی ساردەمەنی و چایدا پەیڕەو دەکرێن؟

- چۆن هەڵسوکەوت بکرێت بۆ کۆتایی هێنان بەو چاوپێکەوتنانەی کە لە کاتی دیاریکراوی خۆی تێدەپەڕێت؟

- ئەو زانیارییانە کامانەن کە بە تایبەت و نهێنی دادەنرێن و نابێت ئاشکرا بکرێن لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی هەر مەوعیدێك کە لەوەو پێش دیاریکرابێت؟

- ئەو کاروبارە جیاوازانە چین کە پێویستە جێبەجێ بکرێن لە کاتی ئەنجامدانی هەندێ چاوپێکەوتن کە مۆرکێکی تایبەت وەردەگرن؟

★ ڕێنمایی و ڕێوشوێنی پراکتیکی:

- پێویستە سکرتێر خشتەیەك لە چاوپێکەوتنە جێگیرەکان (ساڵانە- مانگانە- هەفتانە- ڕۆژانە) بۆ بەڕێوەبەر ئامادە بکات بۆ ئەوەی لە کاتی دانانی مەوعید بۆ کەسانی تر ئەو خشتەیە لەبەرچاوبگیرێت و تێکەڵی لە مەوعیدەکاندا دروست نەبێت.

- پێویستە لە کۆتایی ڕۆژدا خشتەی مەوعیدەکان پیشانی بەڕێوەبەر بدرێت تا بزانێت ڕۆژی دواتر چاوپێکەوتن لەگەڵ کێدا ئەنجام دەدات؟

- سەرەتای هەموو ڕۆژێك خشتەکە پیشانی بەڕێوەبەر بدرێت بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات بۆ چاوپێکەوتنەکانی ئەو ڕۆژە.

- پێویستە میوان لە کاتی دیاریکراوی سەردانەکەی ئاگاداربکرێتەوە تاکو کاتی چاوپێکەوتنی کەسانی تر لەگەڵ بەڕێوەبەر نەگرێت.

- ئەگەر لە دۆخێکدا ناچاربوون بە هەڵوەشاندنەوەی هەر مەوعیدێکی دیاریکراو، پێویستە لە کاتی گونجاودا لایەنی بەرامبەر ئاگاداربکرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت سود لەو کاتەی وەربگرێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی تری، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی مەوعیدەکەی بە شێوازیکی جوان و پەسەند.

- لە دۆسیەیەکی تایبەتدا خشتەی میوانان هەڵبگیرێت و بپارێزرێت تا لە داهاتوودا لە کاتی پێویستدا سودی لێوەربگیرێت.

١١٣ شێوازو ڕێگا بۆ یارمەتیدانت لەسەر بەرزکردنەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان و زاڵبوون بەسەر ڕێچکەی دواخستندا

# چۆن زۆرترین بەرهەم لە کەمترین کاتدا بەدەست دێنیت؟

بەشی چوارەم

**:شێوازو تەکنیكو هەنگاوە کاریگەرەکان:**

٥٧- دووربکەوە لە دابڕانە تایبەتییەکان (کەسییەکان)، کە کارێك ئەنجام دەدەی ئەوەی کە پێویستە کەس نەیەتە ناو کارەکەتەوەو سەرقاڵت بکات، زۆرترین بەرهەم لەو کاتەدا بەدەست دێت کە گورو تینت زیاتر دەبێت بۆ کارەکەتو تا نزیکتر بیت لە ئەنجام، بەربەستەکان زیاتر دەبن، بۆیە لێ مەگەڕێ ڕووبدات، شێوازەکانی وەك دانانی ئاگاداری لەسەردەرگا یان نامەی دەنگی بەکاربهێنەو ئەگەر ناچار بوویت لە شوێنێکی دوور بگەڕێ کە کەسانی تر نەتدۆزنەوە،و یان کاتەکەت بگۆڕە بۆ ئەوەی لەوپەڕی چالاکیدا بیت.

٥٨- فێربە ئەو ئەرکانە فەرامۆش بکە کە ئەنجامیان نییە، هەر کاتێك هەنگاوی ئەمرۆت زۆر گرنگ نەبوو کاتی تێدا بە فیڕۆ مەدە، چونکە لە کاری بەرهەم کەم دووردەکەویتەوەو بە بەرهەمتر دەبیت.

٥٩- هەموو گەشتە ناپێویستەکان هەڵبوەشێنەوە، تەکنەلۆژیای نوێ بەکاربهێنە کە کاتت بۆ دەگێڕێتەوە، وەکو تەلەفۆنو فاکسو ئیمەیڵ بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانی ڕۆژانەت، دوورکەرەوە لە سەردانە تایبەتیەکانت بۆ دەست خستنی کاتی زیاترو بەرزکردنەوەی تێکڕایی بەرهەم هێنان.

٦٠- بیروڕات لەسەر تۆمارکەر (مسجل) تۆمار بکە،و یان پرۆگرامی دەنگی کۆمپیوتەری بەکاربهێنە، لە دوایدا وشەکان بکە بە دەستەواژەی گونجاو، ئەمەش ئاسانترین ڕێگایە بۆ دەربڕینی بیروڕات بە بێ ماندووبوون بە نووسینی درێژدادر، چونکە نووسین لە لای زۆرێك لە خەڵك کارێکی بێزارکەرە، بەڵام قسەکردن ئاسانە چونکە لەبەردەم جەماوەر نییە، هەرچەندە زۆرجار نووسین کاریگەرترە ئەگەر بە مەبەستی پەیوەندی نێوان دوو کەس بەکارهات.

٦١- وادەی کۆتایی بۆ هەر ڕۆژێك دیاری بکە، جا چ پێی ڕازی بوون یان نا، وادەی کۆتایی تێکڕایی بەرهەم هێنان زیاد دەکات، تاوەکو لەوادەی کۆتایی بە ئەنجام گەیاندنی کارەکە نزیك بینەوە، هەڵسە بە دانانی وادەی کۆتایی مانگانەو هەفتانەو ڕۆژانە، چونکە تا نزیکتر بینەوە کارەکە بە باشتر ئەنجام دەدرێت، وەکو هێزێکی پاڵنەری گرنگ کار دەکات بۆ بەرزبوونەوەی بەرهەم هێنان.

٦٢- لە کاتی قسەکردن بە تەلەفۆن بوەستە، چونکەوەستانوادەکات کە ڕاستەوخۆ لەسەر بابەتەکە بدوێیتو پەیوەندییەکی بەرهەم هێنەر هەبێت، ئاسانە کە دابنیشیو لەو کاتەدا پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە درێژە دەکێشێت.

٦٣- کۆمەڵێك ئەرکی چون یەكو بچووك بەیەکەوە کۆبکەوەو لەهەمان کاتدا ئەنجامیان بدە، وەڵامی هەموو پەیوەندییە تەلەفۆنیەکان بدەرەوە کە تایبەتن بە بابەتێك لەم ڕۆژەدا، وا باشتریشە کە لە کاتی کۆتایی هێنانی خشتەی کاری ڕۆژانەوە بێت، تەواوکردنی ژمارەیەك ئەرکی بچووك ئاسانترە لە ناوەڕاستی سەرقاڵی کارەکان،و کۆششکردنت یارمەتیدەرتە بۆ سوودوەرگرتن لە کاتەکانت، کۆکردنەوەی ئەرکە بچووکەکان بەیەکەوە وەکو کاروباری بانكو پۆستەوەرگرتنو دانەوەو نوێکردنەوەی بنەمای داتاکانو وەڵامدانەوەی ئیمەیل، چونکە ناچار کردنت بە گواستنەوە لە چالاکییەکەوە بۆ یەکێکی ترو گەڕانەوە بۆی جارێکی تر زۆربەی کاتت بە فیڕۆ دەدات لە هەوڵدان بۆ دووبارە وردبوونەوەو چوونەوە سەر کارەکە.

٦٤- کۆبوونەوەکان بە توانستێکی بەرز بەڕێوەبەرە، پێشتر وادەکەی دیاری بکەو پابەند بە پێوەیو لەکاتی دەست پێکردنیش دەرگا دابخە، ئەو کەسە مەشکێنە کە درەنگ دەگات، هەردەم با وا بناسرێی کە کەسێکی پابەندیوادەی کۆبوونەوەکانی، بەم شێوەیە کارمەندەکان زووتر تێ دەگەن کە تۆ کەسی کاریو لەم کاتەدا کۆبوونەوەکان بەرهەم هێنەر دەبن، کۆبوونەوەکان لە کاتی دووبارە نەبووەوە دامەنێ وەکو کاتژمێر ١,٥٠ی ئێوارەو یان ٣,٤٥ی ئێوارە.

٦٥- ڕووبەرووی خودی خۆت بەرەوە، هەموو کات هەوڵدە کە بەسەر خودی خۆتدا سەرکەوی، بیرو هۆشت بخە سەر شێوازێك کە زۆرتریت توانستی دەبێت بۆ هەمان ئەرکی کە پێت سپێردراوە، بە ئەنجام گەیاندنی وەکو ئەوەی کە یارییە، دەتوانی زۆرترین ئەرك بە سانایيو بە خۆشییەکی زۆر ئەنجام بدەی.

٦٦- لیستێك بۆ ئەرکەکانت ئامادەبکە لەسەر یەك لاپەڕە، هەموو ئەرکەکان بنووسە

بە بێ گرنگی دان بەزنجیرەیەکی گونجاو، دوای تۆمارکردنی هەر ئەرکێك، بیکە بە ٣ گروپی جیا لە ئەرك (أ، ب، ج) بە بەکارهێنانی پێنوسی رەنگاورەنگ،و بە دابەشکردنیان دەتوانی دووبارە زنجیرەکانیان رێکبخەیتەوە لە پلانی رۆژانەدا،و بەم شێوەیە سەرەتای ئەم رۆژەت دەزانی کە چ کارێکی گران رووبەرووت دەبێتەوە.

٦٧- هەموو تۆمارە گرنگەکان بە یەکەوە دابنێ، با رۆژانە تەنها پلانی ئەو رۆژەت لە لابێ، باشتریشە کە لیستی ئەرکەکان بەشێك بێت لە خشتەی کارەکانتو فایلە هەمیشەییەکان بپارێزەو دوور کەرەوە لە دانانی تێبینی لەسەر زەرفی نامە یان پارچە کاغەزی بچووك، فایلی پلانەکەت بەکاربهێنە بۆ تۆمارکردنی تێبینیەکان، هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی زیاتر لە پلانێك دەبێتە هۆی زیادکردنی دەرفەتی کەم بوونی بەرهەم هێنان،و بە گواستنەوەو دووبارە نووسینەوەی داتاکان هەنگاوێکی گرنگت لە دەست دەچێت.

٦٨- لە هەموو پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا یەکسەر بچۆرە سەر بابەتەکەو زۆربڵێی مەکە، وا بکە کە پەیامەکەت کورتو سوود بەخش بێت، یەکسەر برۆ سەر بابەتە سەرەکیەکەو رێزو کاتی کەسانی ترت لە بەرچاو بێ، بەم شێوەیە مامەڵەت لە گەڵ دەکەنەوە.

٦٩- تۆماری ئەلیکترۆنی بۆ ئەركو بەرپرسیاریەتیت دابنێ، بە متمانە کردنت بە کۆمپیوتەر بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ تۆمارکردنی بەردەوام، چونکە زووبێ یا درەنگ لە باری داروخانی دەروونی دەرباز دەبی، بەکارهێنانی کۆمپیوتەریش یا سەرکەوتوو دەبێ یا نا، چونکە گەر هاتوو هەموو شتەکانت لەسەری تۆمارکرابوو بە بێ بوونی تۆماری تری نوسراو لێرەدا تووشی داروخان دەبی، بەڵکو لە سەر پەرەش شتێکت هەبێ ئاوەها دەتوانی سەرچاوەیەکت هەبێ بۆ قەدەغەکردنو ونبوونی زانیاریەکان.

٧٠- با هەموو کات بەرهەمهێنەر بی، پاداشتی خۆت بکە بە شێوەیەکی جوان، ژیان لە زۆربەی بارەکان یارییەکی زیرەکانەیە، هەندێکجار لەگەڵ خودی خۆمان هەڵدەستین بە فێڵ کردنو یاری بچووك کەوا دەکات ئاستی نوێ لە بەرهەمهێنان بدات بە دەستەوە،و دەست خۆشی کردنت لە خۆت ئەگەر بە وشەی باشیش بوو یارمەتیت دەدات بۆ بەرهەمی زیاتر.

٧١- پاداشت کردن بۆ خۆت یا بۆ گروپەکەت یارمەتیدەرە بۆ کۆششی زیاترو بەرهەمی زیاتر، بە دانی بەڵێنو پاداشت کاتێك کە دەگەیتە ئامانجی کۆتایی لە کاتێکی دیاریکراو.

٧٢- پلانەکەت بپارێزە، بوونی ئەم تۆمارە لە بەردەستدا بۆ پرۆژەیەکی گران پاڵنەرە بۆ ئەنجامدانی زیاتر، پلانەکەت وەکو لیستێك بۆ پێداچوونەوەو لابردنی هەر کاتێکی کە تەواو دەبێت، یارمەتیدەرە بۆ بەردەوام بوونووات لێدەکات کە وردبین بیت.

٧٣- گرنگ نییە کە لە یەکەم خاڵەوە دەست پێ بکەیت، هەندێجار وا باشترە کە لە هەر خاڵێکی پرۆژەکە دەست پێبکەیت، بە هەوڵدان بە پابەندبوون بە سەرەتای جێبەجێکردنی کە لەسەری راهاتووی، لەوانەیە ئەنجامێکی پێچەوانە بدات بە دەستەوە، ئەگەر سەرەتاکەی زەحمەت بوو، دوور بکەرەوە لێیو بچۆ سەر ئەوەی کە دەتوانی ئەنجامی بدەی، کارێکی ساناتر هەڵبژێرەو یەکەمجار ئەنجامی بدەو ئەوانی تر بە ئاسانی ئەنجام دەدرێت.

# هونەری کۆبوونەوە

دوای زنجیرە باسێك سەبارەت بەکۆبوونەوە ئاماژەمان بە زۆربەی ئەو بابەتانە کرد کە پەیوەندیدارە وێرای ئەوەی کە پێویستە هەموو کەسێك لە هەر پۆستێکی کارگێڕیدا بێت بەردەوام هەوڵی دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیری خۆی بداتو لە بابەتە جۆربەجۆرەکانی کارگێڕیدا بخوێنێتەوە، هاوکات سوود لە ئەزموونەکانی خۆیو کەسانی تر وەربگرێت، کۆتایی زنجیرە باسەکەمان بەم چەند ئامرازە کۆتایی پێ دێنین کە پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی کۆبونەوەکان، لە داهاتووشدا بە بابەتی نوێ ئەم بوارە بەسەر دەکەینەوە:

## زنجیرەی کۆتایی

خشتەیەك بۆ نەخشەدانان بۆ کۆبوونەوەکان:

| ز | ئایا ئەم کارەت کردووە؟ | بەڵێ | نەخێر | تێبینیەکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەبەستی بەستنی کۆبونەوەکەت دیاری کردووە؟ | | | |
| ٢ | ئامانجەکانی کۆبوونەوەکەت دیاری کردووە؟ | | | |
| ٣ | ئامادەبووانت هەڵبژاردووەو رۆڵیانت دیاری کردووە؟ | | | |
| ٤ | شێوازی بڕیاردانت دیاری کردووە؟ بۆنمونە بەدەنگدان، بەکۆی دەنگ، سەرۆکی کۆبوونەوەکە. | | | |
| ٥ | بڕیارت داوە کە کەیو لەکوێ کۆبوونەوەکە دەبەسترێتو دڵنیایت لە دابینکردنی شوێن؟ | | | |
| ٦ | هەموو پێویستیو پێداویستی یەکانت ئامادەکردووە؟ | | | |
| ٧ | ئامادەبووانت ئاگادار کردووە سەبارەت بەکاتو شوێن؟ | | | |
| ٨ | خشتەی کاری سەرەتاییت دیاری کردووەو ئامانجو مەبەستت بە روونی تێدا دیاری کردووە؟ | | | |
| ٩ | خشتەی کارت بەسەر ئامادەبوواندا دابەش کردووە؟ | | | |
| ١٠ | فۆرمی کۆتایی خشتەی کارت داناوەو دابەشت کردووە بەسەر ئامادەبوان دا؟ | | | |
| ١١ | هیچ راپۆرت یا شتێکت ناردووە بۆ ئامادەبووان پێویستی بە ئامادەکردن هەبێت؟ | | | |
| ١٢ | دڵنیا بوویت کە هەموو ئەندامە سەرەکیەکان ئامادە دەبن؟ | | | |
| ١٣ | خۆت بە تەواوی ئامادەکردووە بۆ کۆبوونەوەکە؟ | | | |

کێشە و بڕیار

# سەرکەوتنی کۆمپانیاکانی سۆفتوێر وابەستەی چییە؟

م. پێباز محمد صادق

کۆمپانیای (کورد سۆفتوێر) بۆ پرۆگرامی کۆمپیوتەر لە شاری دهۆك لەگەڵ یەکێك لە کۆمپانیاکانی وڵاتی میسر بە ناوی (خفرع للمحسابة) ڕێککەوتووە بۆ کارکردن لەسەر بڵاوکردنەوەی بەرنامەیەکی تایبەت بە ژمێریاری بۆ کۆمپانیاو پرۆژە بازرگانییەکان، خستنە ڕووی ئەم بەرنامەیە جیاوازە لەو شێوازەی ئێستا باوە لە بازاڕی ئێمەدا.

نرخی ئەم بەرنامەیە ($١٠٠)ە تەنها بۆ یەك کۆمپیوتەر بە کاردێ، بریتییە لە بەرنامەیەکی کامل بۆ حساباتی گشتی هەر پرۆژەیەك، لە دوو توێیدا هەموو ئەو داتایانە دەخاتە ڕوو کە پێویستن، هەر لە داخڵ بوونی کەرەستە بۆ مەخزەن هەتا کردنی بە پسولەی فرۆشتن، لەو نێوەندەشدا بڕی کەرەستەی کۆگاکراو بڕی قەرز لە بازاڕداو بڕی قەرزاری، موچەی کارمەند، باج و تێچونەکان... هتد. چەندین دیرەکی تر کە بۆ حسابات پێویستن.

هەر شەش مانگ جارێك ئەم بەرنامەیە پێویستی بە ئەبدەیتێکە لە ڕێی ماڵپەری کۆمپانیا میسرییەکەوە بە پاسۆردی تایبەت، بە بڕی ($٦٠) دەتوانرێ ئەنجام بدرێ، کاری وەرگرتنی ($٦٠) دۆلارەکەو پێدانی پاسۆردو ناو بۆ داخڵ بوون لە لایەن (کورد سۆفتوێر)ەوە ئەنجام دەدرێ، بە ئاگاداری کۆمپانیا میسرییەکە.

کڕیاری ئەم بەرنامەیە بە هۆی ئەبدەیتەکەوە دەگاتە تازەترین سیستەمی حساباتی جیهانی کە کۆمپانیا پسپۆڕەکانی ئەو بوارە دروستی دەکەن، هەر لەو ئەبدەیتەوە باشترین دژەڤایرۆس وەردەگیرێ بۆ شەش مانگی داهاتوو، جگە لەوەش بەکارهێنانی بەرنامەکە بە پێی جۆری کارەکەی خۆی لە هەر بوارێکدایە، دەتوانێت زانیاری و ڤێرژنی تایبەت بەو بوارەی خۆی وەرگرێت، بە ڕای هەڤاڵ خاوەنی کۆمپانیای (کورد سۆفتوێر) هەنگاوێکی باشە بۆ کۆمپانیاکەی، ئەو لە مێژە هەستی بەوە کردووە کە بازاڕی کوردستان پێویستی بە خزمەتگوزارییەکی لەو جۆرە هەیە.

ئاشکرایە کە فەراغێکی زۆر هەیە لە خستنەڕووی ئەو جۆرە خزمەتگوزارییە، هەروەها سستییەکی تەواو هەیە لە پرۆژە بازرگانییە مامناوەندەکاندا بۆ قبوڵ کردنی سیستەمی حسابات، هۆکاری ئەوە لەوانەیە گرانی نرخی بەرنامە دروستکراوەکان بێت، ئەم کارەی هەڤاڵ بە جۆرێکە لە کۆمپانیا گەورەکانەوە تا مینی مارکێتەکان دەتوانن سود مەند بن لێی، کە ئەوەش خزمەتێکی گەورەیە بە کەرتی بازرگانی گشتی.

ئاستەنگی بەردەم هەڤاڵ چۆنییەتی بەڕێوەبردنی بازارە، کۆمپانیای (دایك) لە میسر داواکارییەکانی ئاسان نییەو (کورد سۆفتوێر) پەیوەست دەکەن بە فرۆشتنی بڕێکی زۆر لە بەرنامەکە، بۆیە سودی کارکردن لەو بوارەدا لە زۆر فرۆشتندایە، چونکە هەر کڕیارێك پەیوەست دەبێت کە مانگانە ($١٠) بدات بۆ ئەوەی زۆرترین سود لە پێشکەوتنە جیهانییەکانی بواری ژمێریاری وەرگرێت، پرسیاری سەرەکی لای هەڤاڵ ئەوەیە کە لەسەر چ نەخشەیەك بجولێت تاوەکو لە ئاستی داواکارییەکانی بازاڕدا بێت؟

*** *** ***

ئەو پرسیارەی لە مێشکی هەڤاڵدا هەیە پرسیارێکی جەوهەرییە (چۆنێتی زاڵ بوون بەسەر بازاڕدا؟)، ئەگەر لە کاتێکدا (کورد سۆفتوێر) بتوانێت چەندین بەرامبەری داواکارییەکانی (خفرع للمحسابة) بفرۆشێت هێشتا بە سەرکەوتوو نازانرێت، سەرکەوتنی تەواو ئەوەیە کە دوای فرۆشتنی بەرنامەکە بتوانێت تاسەر خزمەتی کڕیارەکە بکرێت بۆ ئەوەی ئەویش بەردەوام لەگەڵ (کورد سۆفتوێر) بمێنێتەوە.

لێرەوە پێویستە کاك هەڤاڵ وەك پرۆژەیەکی سەربەخۆ سەیری ئەو کارە بکات، ئەو پێویستی بە پەخشکردنی بەرهەمەکە هەیە، بۆ ئەوەی زیاد بفرۆشێت و پێویستی بە خزمەتگوزاری کڕیاران هەیە، تاوەکو مشتەرییەکانی بپارێزێ، کەواتە دروستکردنی بەشی خزمەتگوزاری کڕیاران ئەرکێکی ئێستای (کورد سۆفتوێر)ە، بێگومان کۆمپانیا میسرییەکەش هەمان داواکاری دەبێت، بوونی ئەم بەشە تەنها بوونێکی فیزیکی نییە، بەڵکو پێویستە لە ڕۆحییەتی کارکردنی کۆمپانیاکەی هەڤاڵدا هەبێت نەك تەنها ژوورێك و کورسی و مێزو کۆمپیوتەرو فەرمانبەرەکانی بێت، بوونی ئەم بەشە فەلسەفەیەکە پێویستە ئیستیعاب بکرێ، بیرۆکەیەکە دەبێت شی بکرێتەوە، بۆ ئەو کەسانەی لەو بوارەدا کاردەکەن.

مارتین کریستۆڤەر (مامۆستا لە زانکۆی کرانفلد- قوتابخانەی بەڕێوەبردن) دەڵێت: دوو ڕێگا هەیە بۆ سەرکەوتنی کۆمپانیاکەت:

یەکەم/ دابەزین بۆ بازاڕ بە بەرهەمێك کە لە بازاڕدا نەبێت.

دووەم/ دابەزین بە خزمەتێك کە هاوشێوەی لە بازاردا نەبێت.

هەڤاڵ ڕێگەی یەکەمی بۆ کراوەیە، بەڵام سروشتی کارەکەی هەڤاڵ پێویستی بە ڕێگای دووەمیش هەیە، ئەگەر وانەبێت ئەوا ڕێگەی یەکەمیش بۆ (کورد سۆفتوێر) دەبێتە کوێرەوەری، دروستکردنی بەشی (خزمەتگوزاری کڕیاران) کە دواجار بۆ (کورد سۆفتوێر) دەبێتە (خزمەتگوزاری بەشداران)، پێویستە کۆمەڵێ کەسی زۆر شیاوی بۆ دابنرێت، کە خاوەنی چەندین سیفەتی وەك: ڕێز، متمانە، ڕەوشت، سۆزو...هتد بن، ئەم خەسڵەتە هەمووی قازانجی زۆر دەخەنە گیرفانی کاك هەڤاڵەوە بە بێ ئەوەی هیچ مەبلەغێك لەسەر تێچونەکانی میزانییەی کۆمپانیا زیاد بکات.

پاشان ئەو فەرمانبەرانەی لەو بەشەدان پێویستە ڕابهێنرێن لەسەر چۆنییەتی گەیاندنی

سود بە کڕیاران، بە جۆرێك وا هەست بکەن سودی کڕیار سودە بۆ خۆیان و کۆمپانیاکەیان، دەبێ کاك هەڤاڵ ئەرکــی ڕاهێنانی فەرمانبــەرەکان بگرێتە ئەســتۆ، جا ئەگەر لە ڕێــی پەیمانگای تایبەت بە بواری کارو بەڕێوەبردن بێت یاخود کەسی پسپۆر ئــەو کارەی بۆ بکات، بێگومان ئەرکی ڕاهێنان کەم نییە، بەڵام دەگەڕێمەوە بۆ وتەکەی حاکمی دوبەی (محمد راشد ال مكتوم) کە دەڵێ: (ئەگەر ڕاهێنان بە گران بزانین، پێویستە ئەوەش بزانین کە نرخی نەزانین چەندە؟).

چــوار خــاڵ دیاریکــراوە بــۆ پابەندبوونی فەرمانبەرانی بەشــی خزمەتگــوزاری کڕیاران، لە لایەن (یاسر جاد)ەوە کە هەڵسوڕاوی ئەو بوارەیەو لە کۆمپانیای (ئەجیال)ی بەرنامە سازیدا سەرۆکی بەشی (الدعم الفنى)یە:

١- وردبینــی: لەبەرئــەوەی ئەو کەســانەی لەو بەشــەدا کاردەکــەن مامەڵەی ڕاســتەوخۆیان لەگەڵ کۆمەڵێ داتای زۆر هەســتیارو زانیــاری وردو گرنگدا هەیــە، پێویســتە بــە ئەوپــەڕی وردییــەوە لەگەڵ ئــەو بــواردەدا هەڵ بکــەن، چونکە ئــەو داتایانە بۆ کۆمپانیــا کڕیارەکە وەك ڕۆح وایە بۆ جەســتە، بۆیە هــەر هەڵەیەك لە دانانی داتاکانــدا ئەنجامی هەڵەی لــێ دەکەوێتــەوە، بەمەش کۆمپانیاکە توشــی زەرەر دەبێت.

٢- دینامیکــی: بــە حوکمــی ئــەوەی کاری خزمەتگوزاری مامەڵەکردنە لەگەڵ کڕیاردا، کەواتە کاری ســەرەکی ئەو بەشــە گەڕانە بــە دوای ئەو خواستانەی کڕیار کە تۆ بۆت جێبەجێ نەکردوون، هەر بۆیە بەشــی خزمەتگوزاری کڕیاران ئەڵقەی گەیاندنە لە نێوان بەشی پەرەپێدان و کڕیارەکەدا، ئەم گەیاندنە وا دەکات کە پلانی ســاغکردنەوەی کۆمپانیــا پلانێکی ســەرکەوتوو بێت، بەهۆی ئەو دانوســتانەوە کە لە نێوان بەشی خزمەتگوزاریی و کڕیــاردا هەیە، چونکە دەتوانــرێ پەرە بە کاڵاکە بدرێ تاوەکــو زیاتر هاوتای خواســتەکانی کڕیار بێت، ئەمەش دینامیکییە نەك ستاتیکی.

٣- خێرایــی: لە هەردوو پرۆســەی دابەشــکردن و خزمەتگوزاریدا ســیفەتی (خێرایی) تا ســەر ئێســقان کاریگەری هەیە، چونکە گەر لە کاتی خۆیدا چارەسەری کەموکورتییەکان نەکرێت ئەوا لای کڕیار پرسیار لەسەر بەدیلی تۆ دروست دەبێت، بۆیە کات چەند لە خزمەتی پرۆژەکانی (کورد سۆفتوێر)دایە هێندە ترسناکە ئەگەر پڕ بەخۆی سودی لێ نەبینرێت.

٤- متمانە: کارمەندی بەشی خزمەتگوزاری پێویستە کەسێکی باوەڕ پێکراو بێت، لە دوو لایەنەوە:

یەکەم: متمانەی هەبێت لە ڕووی توانای زانستییەوە کە بتوانێت چارەسەری کێشە تەکنیکییەکان بکات.

دووەم: متمانە بە دزە نەکردنی زانیارییەکانی حساباتی کۆمپانیای کڕیاری بەرنامەکە.

ئــەو خاڵانــەی باســکران ئاماژەیەکــی گرنگن بۆ سەرەتای دەستپێکردنی کاری (کورد سۆفتوێر) بۆ پرۆژەی ناوبراو بە تایبەت ئەمــڕۆ هەر کاڵایەك خزمەتگوزاری لەگەڵدا نەبێت بێگومان تەمەنی کەم دەبێت، جا ئەگەر کاڵاکە خۆی جۆرێــك بێت لە خزمەتگوزاری ئەوا زیاتر پێویستی بە دەمەوەچوونی کڕیاران دەبێت.

# گەر دەتەوێت بەردەوام بیت لە کارەکەتدا کڕیارەکانت ڕازی بکە

و/ محەمەد هاشم

زۆربــەی خەڵکی ئەمــڕۆ زیاتــر لەکارێك ئەنجــام دەدەن لــە یــەك کاتــدا بۆئــەوەی پێداویســتیەکانیان جێبەجێ بــکات، زۆرجاری وا هەیە ئــەو ئیش و کارەی ئەنجامی دەدات زۆر دوورە لە حەزو ویســت و ئارەزووەکانەوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە بە هیچ شێوەیەك ڕاهێنانی تــەواوی پێ نەکراوەو زانیاری تەواوی پێ نەبەخشراوە لەم بوارەدا. ئاشکراشە دروشمی زۆربەی دامودەزگاکان ئەوەیە (ئیشــێکی زۆر بە کەسانی کەم)، ئەنجامی ئەم جۆرە کارانەش هەر دەبێت، بۆیە دەبینین فەرمانبەر توانای نامێنێت و کاریگەری دەبێت لەســەر کارە سەرەکییەکانی و دەبێتە بەربەســت لە بەڕێوەچوونی کارە تاك و بەکۆمەڵەکاندا.

کاتێــك دەبێتە کۆتایی هاتنــی کاتی دەوام کارەکان تــەواو دەبێــت بــێ ئــەوەی ئەنجامی کارەکان دیــار بێت، ئەمــەش کاریگەری خراپی دەبێــت لەســەر بەرژەوەندییەکانــی کۆمپانیا، لەهەمان کاتدا کاریگەری دەبێتە ســەر هەمیشە کڕیارەکانیش، کە لــە کاتی دیاری کراوی خۆیدا خزمەتگوزاری و بەرهەمەکان نەگاتە دەســتیان ئەمــەش کاردانــەوەی خراپی دەبێــت لەنێوان کۆمپانیاو هەمیشە کڕیارەکان.

دەتوانیــت فەرمانبەرێکــی ســەرکەوتوو کاریگەر بیت ئەگەر هەڵگری کۆمەڵێك لە ئاکارو شــێوازی پەیوەندی لەگــەڵ دەورووبەرتدا بیت بۆ ئــەوەی پەرە بــە تواناکانت بدەیــت لەکاتی گفتوگۆکــردن و پەیوەنــدی لەگــەڵ هەمیشــە کڕیارەکانتدا.

شێوازو کەناڵەکانی پەیوەندی –ڕاستەوخۆو ناراســتەوخۆ- لــەم ڕۆژگارەمانــدا زۆر بــووە، جــاری وا هەیــە دەبێتــە هۆی دروســت بوونی تێنەگەیشــتنێك لە نێوان کۆمپانیاو هەمیشــە کڕیــارەکان، بــۆ ئــەوەی خــۆت بپارێزیت لەم کێشەیە پێویستە لەسەرت:

١- هەوڵ بدە ئەو پەیامەی کە دەیگەیەنیت بە هەمیشــە کڕیارەکانت – چ لە ڕێگــای تەلەفۆنەوە بێت یان ئیمێل یان دانیشتنی ڕووبەڕوو لەگەڵیدا– ڕوون و ئاشکرابێت و هیچ شاراوەیی تێدا نەبێت بۆ ئەوەی دوور کەویتەوە لە دروســت بوونی کێشــە لەکاتی پەیوەندیدا، ئەگەر مەشق و ڕاهێنانی تەواو نەکەیت لەســەر ئەم شــێوازە ئەوا پەیامەکەت بە ناتەواوی و شاراوەیی دەمێنێتەوە، ئەمەش کاریگەری خراپــی دەبێتە ســەر ئــەو خزمەتگوزریانەی کە پێشکەشــی دەکەیــت، وشــەی گونجــاوو جــوان و ڕوون و دیــار هەڵبژێــرە بــۆ ئــەوەی بتوانیت بە ئاسانی مەبەســتەکانت بگەیەنیت، جاری وا هەیە وشــەی کورت بەکار دێنیت بــەڵام ئەمە باش نییە بۆ ڕەواجدانــی بەرهەمێك یان خزمەتگوزارییەك، چونکە کڕیار پێویســتی بە زانیاری زیاتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت تێگەیشــتنێکی تەواوی لا دروست بێت و بەرهەمەکە بکرێت.

٢- کاتێــك لەگــەڵ هەمیشــە کڕیارەکانتدا دەدوێیت، پێویســتە دەنگت بیستراوو زۆر بەرز نەبێت، هەوڵ بدە زاڵ بیت بەســەر هەموو ئەو کاریگەرە دەرەکیانەی کە دەبنە هۆی قسە بڕین و تەشــویش کردن، بۆ ئــەوەی بتوانیــت هەموو زانیاری و داتا پێویستەکان بە ڕوونی و ئاشکرایی بگەیەنیتە بەرامبەرەکەت. گوێگرێکی باشــبەو گرنگی بــدە بە بۆچــوون و ڕێنمایی هەمیشــە کڕیارەکانت، چونکە وتەکانی ئەو تیشك دەخاتە ســەر زۆربەی ئەو کێشــانەی کە پێویستە دوور کەویتــەوە لــە داهاتــوودا، هەر بۆیــە هونەری گوێگرتــن دادەنرێ بە گرنگتریــن هەنگاوەکانی ســەرکەوتن لــە پەیوەندیدا بــۆ خزمەتکردنی هەمیشە کڕیارەکان.

٣- ڕێزگرتــن لە هەمیشــە کڕیــارەکان دادەنرێ بــە گرنگترین مەرجەکانی ســەرکەوتن لەکاردا، بۆیە پێویستە لە کاتی گفتوگۆکردن بەڕێزەوە لەگەڵی قسە بکەیت و نەرم و نیان بیت و لەگەڵ هەموو قســەیەکیدا هــەڵ نەچیــت و بەرپەرچــی بدەیتــەوە، چونکــە لەوانەیە میزاجی تەواو نەبێت و کێشــەیەکی هەبێت ڕەنگدانەوەی لەسەر دانیشتنەکە هەبێت، بۆیە هەوڵ بدە بەسەلیقە بیت و لەگەڵ قسەکانی بەردەوام بیت و بەرپەرچی مەدەوە لەکاتی هەر وتەو کردارێکی.

٤- هەمیشــە لە بیرت بێت، بەدەســتهێنانی متمانــەی کڕیــارەکان و ســووربوون لەســەر گەیاندنی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان بۆیان لە کورتترین مــاوەو بەکوالیتییەکی بەرز، دادەنرێ بــە بنەمایەکــی زێڕین بــۆ بەدەســت هێنانی قازانجــی گەورە بۆ کۆمپانیاکــەت و جیاوازترت دەکات و ســەرکەوتووت دەکات لــە کارەکەتــدا، پاشان بەردەوامیت پێ دەبەخشێت لە کاردا.

علاقات / ژمارە ٢٤ لاپەڕە ٥

بەشی دووەم

م. هاژە شێروانی



# هۆیەکانی گرنگیدان بە زانینی بازاڕسازی

لەو هۆیانـــەی کە بووە هۆی گرنگیدان بە زانینی بازارسازی بریتییە لە:-

١- بوونـــی گۆڕانکاری ناوەکـــی لە هەرەمی پیشەســـازی کە فاکتەرەکانی بـــازاڕو تێچوون دەگرێتەوە.

٢- ئەو کاریگەرییانەی کە حکومەت بەسەر رێکخراوەکانـــی دەســـەپێنی لـــە رێگای کۆتو بەندی یاساییەوە.

٣- دانراوە رکابەرییەکان رۆڵێکی گرنگیان هەیە بـــۆ رێکخراو کە گرنگی بدات بە زانینی بازارســـازی تا لـــە رێگایـــەوە بتوانێت تێبینی رکابەری توووند بکەین لە نێوان رێکخراوەکانو زیادکردنی توانای لە سەر دەرخستنی زانیاری یەکلادەکاتەوە لەگەڵ هەموو ئەو فاکتەرانەی کە لە رێگایـــەوە پێگەی رکابەری رێکخراوەیی پێ باشتر دەکرێت.

٤- بوونی جیـــاوازی لە پێشـــبینی کردنی کڕیـــاردا، بـــە هۆی جیـــاوازی ئاســـتی ژیانو پڕکردنـــەوەی پێداویســـتیو ئارەزوەکانیـــان، بۆیـــە لە ســـەر رێکخـــراوەکان پێویســـتە کە جیاوازی پێشبینی کراو لە سەر کڕیار بەهەند وەرگرێتو لە هەوڵـــی رازیکردنی گەورەترین ژمارە بێت لە سەر ئەو کڕیارانە کە بنکەیەکی فـــراوان بـــۆ رێکخـــراو پێك دەهێنن لە ســـەر بازاڕ.

٥- گۆڕانـــکاری تەکنیکی رۆڵێکی بەرچاوی هەیە بۆ گرنگیدانـــی رێکخراوەکان بە زانینی بازارســـازی کە بە خێرایی تێبینی گۆڕانکاری تەکنیکـــی دەکەین لەگـــەڵ بوونـــی جیاوازی پێداویســـتی کڕیار لـــەم گۆڕانکارییانەدا، هەر بۆیە زانینی بازاڕسازی بە پێویست دادەنرێت بۆ زیندوو راگرتنـــی ئابووری ژمارەیەکی زۆر لـــە رێکخراوەکان، کـــە لە رێگایـــەوە دەتوانن جیهانگەرایـــی لـــە رێکخراوەکانیانـــدا جووڵە پـــێ بکـــەنو جیاکەرەوەیەکـــی رکابـــەری بە دەســـت بخەن، لەگەڵ ئـــەو بەراووردکردنەی کە دەتوانێت دەســـتی بکەوێت بە تەواوکردنی چالاکیـــە جیاوازەکانی کە لـــەم رێکخراوە بە ئەنجام گەیەندراون.

سیماکانی زانینی بازاڕسازی/

لـــە گرنگترین ئەو ســـیمایانەی کە زانینی بازارســـازی پێشکەشـــی رێکخـــراوی دەکات ئەمانەن:-

١- ئاســـتەمی لاســـایی کردنـــەوەی زانینی بازارســـازی لە لایەن رێکخـــراوەکان، ئەمەش بـــە هۆی ئەوەی کـــە پرۆســـەکانی تایبەت بە زانینی بازارسازی دەکەوێتە ناو چالاکییەکانی زانینی رێکخراوەیین کە لە دەرەوە بە ئاســـانی ناتوانرێت تێبینی بکرێت.

٢- ئاستەم گواستنەوەی زانینی بازارسازی لە نێوان رێکخراوەکان ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە پرۆسەکانی زانینی بازارسازی لە ناوخۆیی رێکخـــراو دەدۆزرێتەوەو ناتوانرێـــت لە بازاڕ بفرۆشرێت.

٣- نەتوانینـــی کەمکردنەوەی، ئەمەش بە هۆی نەتوانینی کەمکردنـــەوەی بە تێپەرینی کات، ســـوودەکانی ئەم پرۆسەیە کەم نابێتەوە

له دەرەنجامی بەکارهێنانی.

٤- ئەو زانیارییانەی کە ڕێکخراو دەستی دەکەوێت لە سەر سەرچاوەکان بە نەبینراو دادەنرێت کەوا لە ڕێکخراو دەکات بە پێشکەشکردنی بەرهەمەکانی لە بازار بۆ کریارەکانی.

٥- ستراتیژیەتی گشتی بەستراوەتەوە بە پسپۆرییە ناوخۆییو دەرەکییەکانی ڕێکخراو، هەر بۆیە جۆری ئەو زانیاری بازارسازییەی کە ڕێکخراو هەیەتی دەتوانێ دەستنیشانی ئەو ڕێگایانە بکات کە پەیرەوی دەکات.

٦- ئەو ڕێکخراوانەی کە زانینی بازارسازی بە شێوەیەکی جیدی وەردەگرن یەکەمجار پێویستیان بە بیرکردنەوەی ستراتیژیو ڕکابەری کردن هەیە لە چوارچێوەی پارێزگاری کردن لە پێگەی زانینی ڕکابەرییان.

پرۆسەکانی زانینی بازارسازی/

پرۆسەکانی زانینی بازارسازی بە کارێکی درێژە پێدەری لێکۆڵینەوەکانی ئاراستەی بازار دادەنرێت لە زۆر لایەن:-

یەکەم: گەلێك لە بوارەکانی ئاراستەی بازار دەگرێتەوە (ئاراستەی ڕکابەر، ئاراستەی کریار، ئاراستەی دابینکەر، ئاراستەی بەرهەم.... هتد) ئەم پرۆسەیە فراوانتر دەبێت بۆ گرتنە خۆی گەرانو لێکۆڵینەوەی تر ئەمەش بە هۆی ڕۆڵی لە تەواوکردنی زانینی بازارسازی، لە دانی متمانە بە خاوەن بریار لە ڕێکخراودا لە ڕێگای ئەو زانیارییەی کە زانینی بازارسازی پێشکەشی دەکات لە کاتی بریاردانا.

دووەم: سەرەرای ئەوەی کە تیشك دەخاتە سەر ئەو چالاکیانەی کە ڕێکخراوەکان پابەندن پێوەی کە بە ئاراستەی بەرەو بازاریان دەباتو سیفەتی پرۆسەداری بە گرنگ دادەنێت بە هۆی ئەوەی کە هەر بوارێك لە بوارەکانی زانینی بازارسازی (زانینی کریار، زانینی بەرهەم، زانینی دابینکەر، زانینی ڕکابەر) وا مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت کە جۆری جیاوازی هەیە لە چالاکییە هەڵسوکەوتییەکانو هەر چالاکییەك گرنگیو سوودی خۆی هەیە، پرۆسەکانی زانینی بازارسازی لە نێوخۆیاندا بە جیاواز دادەنرێت، بۆ نموونە پرۆسەی زانینی کریار جیاوازە لە پرۆسەی زانینی ڕکابەر ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە کریار بابەتێکی سەربەخۆیەو پێویستی بە جۆرێکی جیاواز هەیە لە چالاکییەکانی زانینی فێرکردنو تێگەیشتن.

سێیەم:- پرۆسەکانی زانینی بازارسازی جۆرێك لە نادیاری تیادایە لە کاتی بەکارهێنانی هەندێك لە چالاکییەکانی لە پێوانەکردنی پرۆسەکانی هەر جۆرێکی زانینی بازارسازی، لێرەدا کارگێری ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە دارشتنی زانینی بازارسازی ڕێکخراو و دڵنیابوونی بەرێوەبەران لەو زانیاریەی کە لە بازاردا دەستیان خستووە کاریگەری دەبێت لە سەر دەستخستنی زانیاری تایبەت بە بازار لە سەر کریارو ڕکابەرانو بەرهەمەکانو هتد، هەروەها هەماهەنگی نێوان بەشەکانی ڕێکخراوەیی.










نوسینی د. ئەبراهام جێنیس. لە ئینگلیزییەوە/ محمد ناصر عبدول

# چۆن سەرکەوتوو دەبیت لە ژیاندا؟

سەرکەوتن لە ژیاندا تەنها پەیوەست نییە بە چارەنوس و بەختی مرۆڤەوە تاوەکو ببێتە تاکە ڕێرەوەی ژیان کە چارەنوسی مرۆڤەکان لە داهاتوودا بە ئەرێ و نەرێ دیاری بکات. بەڵکو چەندان لایەنی جۆراو جۆرو پەنهان بەدرێژایی ژیان دەگرێتەوە، سەرکەوتن بریتییە لە دۆخێکی تایبەت کە لە ناخی مرۆڤەکاندا دەخولقێت و دواتر دەتوانرێت مەشق و راهێنانی پێ بکرێت و بخرێتە بواری پراکتیکییەوە تاوەکو لە ژیاندا خۆشگوزەران بیت. چونکە زۆر خەڵك هەیە، هەرچەندە بیرۆکەی سەرکەوتن لە ناخیاندایە بەڵام بونیادی خۆی هێشتا لەو ئاستەدا نییە کە بیخاتە بواری پراکتیکییەوە. ئەوەش یان سروشت یان هۆکارە مرۆییەکان کاریگەری لەسەر هەیە.

هەندێ کەس وادەزانن کە دەبێت سەرکەوتن بەدرێژایی ژیان کاریگەری هەبێ بەسەر هەموو ئاکارو خوورەوشتی مرۆڤەکانداو ڕێنیشاندەرێکی بەردەوام بێت بۆ ئاراستەکردنی بەلای بەرپرسیارێتی و دەستهێنانی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی.

بەڵام هەندێکی دیکە سەرکەوتن دابەش دەکەن بەسەر چەند لایەنێکی جیاواز لە ژیانداو لەسەر بیردۆزەیەك ژیان دەگوزەرێنن کە دەڵێت: مەرج نییە مرۆڤ لەهەموو ساتەوەختەکانی ژیاندا سەرکەوتووبێت. دەبێت ئێمە ئەوەش بزانین کە سەرکەوتن بەدی نایەت تا شەونخونی و ماندوبونی لەپێناودا نەچێژین. ئەمانە سەرکەوتن دەبیننەوە لە پەیوەندییە کۆمەڵاتییەکانیان، بە پلەی یەکەم سەرکەوتنی خێزان، سەرکەوتن لەبواری دارایدا، هەروەها هە ندێ لایەنی تر. گەر گوزەرێك بکەین بە سەربردەی لاپەڕەکانی مێژووی رابردوودا ئەوا چەندین نهێنی ئامێز دەبینین کە مرۆڤەکان بە درێژایی مێژوو ئەنجامیان داوە هێشتاش وەکو شاکارێك لە بوارە جۆر بە جۆرەکان سوودی لێ دەبینرێت، چونکە چەندان کەسی داهێنەرو چەندان کەسی بلیمەت لەم ژیانەدا بوون و نەماون هەر وەکو ئەنیشتاین کە چەندان بیرۆکەی مەزنی داناوەو چەند بیرۆکەیەکیشی داناوە کە هێشتا چارەسەریان بۆ نەدۆزراوەتەوە لە دوای مردنی خۆشی، یان کە سێکی وەکو ئەدیسۆن کە خوێندکارێکی ئاست نزمی زیرەك بووە چوو لە شەمەندەفەردا کاری شاگردی کردو دواتر بەردەوام لە تاقیکردنەوەدابوو، تاکو گەیشتە ئەو ئاستەی کە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی ژیانی داهێنا کە لەو سەردەمەوە تاوەکو ئێستاو لە داهاتووشدا مرۆڤایەتی قەرزاریەتی و سوودی لێدەبینێ، ئەوە جگە لە چەندان داهێنراوەی تریش کە خاوەنەکانیان هەموویان مرۆڤ بوون وەکو ئێمەو زۆریشیان لە سەرەتا هەژارو کەم دەرامەت بوون یان ئاستی زیرەکیان نزم بووە دواتر بیرۆکەی سەرکەوتن هانیدان کە خۆیان لەم ئاستە دەربازبکەن و بگەنە رادەی داهێنان و بەرپاکردنی شۆرشی پیشەسازی.

ئەمانە هەموویان توانیویانە هێزی لە بن نەهاتووی شاراوەی ناخیان پەرە پێبدەن و سەرکەوتنی گەورە تۆماربکەن کە تاوەکو

کۆتایی ژیان ناویان لەناو جیهاندا درەوشاوە بێ، هەروەها توانیویانە بەسەر کۆسپەکانی ژیاندا سەربکەونو چۆکی پێدا بدەن.

هەندێ کەس سەرکەوتن تەنها لە وەدا دەبیننەوە کە خاوەن بەختێکی باش بنو بەمەش هەموو گرەوێك لە ژیندا دەباتەوە. بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیرنەچێت کە سەرکەوتن بۆ داهێنەرو زاناکان پێویستی بە چەندان شەونخونیو کاری بەردەوامو پوخت هەیە کە دەیگەیەنێتە ئەو شوێنە.

هەروەها پێویستی بە ئامۆژگاری چەند پسپۆری بواری سەرکەوتن هەیە کە ئێستا دەتوانین گوێ لە وتارەکانیان بگرینو سەرکەوتن فەراهەم بکەین، لەوانەش (هێنری فۆردو ئەندرۆ کارنیجە).

گومان لەوەدا نییە کە هەموو تاکێکی سەر ئەم زەمینە ئارەزووی سەرکەوتن دەکاتو ئاوات بۆ بەرزی دەخوازێت، بەڵام ئەمە چۆن بە دەست دێت؟ لەسەرەتاوە هەندێ روونکردنەوەمان لەسەرداو ئێستاش هەندێکی باس دەکەین:

یەکەم شت کە پێویستە مرۆڤ لە ناخیدا گەڵاڵە بێت ئەوەیە کە سەرکەوتن پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، لە سەرەتادا پێویستی بە خستنە ناو سیستەماتێکی جێبەجیکردن هەیە، سەرکەوتنیش تەنها بریتی نییە لە رەوشێکی تاك، رێگەکە تەنها پەیوەست بێت بە چارەنووسی مرۆڤەوە بەڵکو لایەنی فراوانتر دەگرێتە خۆ هەروەکو لە سەرەتاوە وتمان.

سەرکەوتن بە شێوەیەکی فەندەمێنتاڵی بریتییە لە هەستکردنی مێشك یان ناخی مرۆڤ بە هەنگاونانی بۆ گەیشتن بە لوتکەی پێویستو دواتر بەردەوام بوونو خستنە ناو چوارچێوەی جێبەجێکردنەوە.

لێرەدا چەند خاڵێك باس دەکەین کە بۆ سەرکەوتن لە ژیاندا پێویستە بیگرینە بەر:

١- بۆ ئەوەی سەرکەوتووبیت دەبێت خاوەنی بریاردانی بوێرانە بیت:

یەکەم هەنگاو کە دەنرێت بۆ سەرکەوتن لە رەورەوەی ژیاندا بریتییە لە بریاردان لە سەر شتێك بۆ ئەوەی بە دەستی بهێنین، هەموومان لەوە باش تێدەگەین کە هیچ شتێك ناجولێت، هیچ بەرەو پێشەوە چونێك روونادات لە هیچ کایەیەکی ژیاندا، هەتا خۆت یەکەم جار بریار لەسەر کردنی ئەو کارە نەدەیت، یەکەم کاریش کە لە یەکەم هەنگاودا دەکرێت بریتییە لە بریاردان لە بەردەوام بوون لەسەر پێشکەوتن، ئەوەش بەبروا بەخۆبوونو پشت بەخۆبەستن دەبێت، ئەوەش بەشێکی بنچینەییو سەرەتاییە لەو هەنگاوەدا کە بە داخەوە زۆر خەڵك لە ژیاندا باز دەدات بەسەر ئەم هەنگاوەداو پێشی دەکەوێت، بەمەش سیستەماتێکی سەرکەوتنی لێ ون دەبێت، لەبەرئەوە بوێرانە بریار بدە لە سەر بەرەو پێشەوە چوونو بەردەوام بوون، ئەمەش بە چەند شێوازێك دەکرێت گرنگترینیان نووسینەوەی ئەو هەنگاوانەیە لەسەر پەرەی کاغەزو پێداچوونەوەی بەردەوامی هەموو رۆژێك بەوەش دەچێتە سەر رێرەوی سەرکەوتن بۆ بەدیهێنانی مەرامو مەبەستەکانی ژیانو دۆزینەوەی رێگە چارەی خۆشگوزەرانی.

٢- هەمیشە لۆگۆ (درووشم)ت لە ژیاندا بریتی بێت لە ئامانجو دیدی روون:

بوونی دروشمی سەرکەوتنو نیگای روون لە ژیاندا یەکێکە لە فاکتەرە گرنگەکانی تری بە دەستهێنانی سەرکەوتن لە ژیاندا، بێ بوونی وێنەیەکی روونی سەرکەوتن لە ناخدا سەرکەوتن مەحاڵە، کە ئەو وێنەیەش دەبینین دەقاودەقی ئەو مەبەستەیە کە دەتەوێت لە ژیاندا بیهێنێتە دیو ببێتە پێشەنگی سەرکەوتن، بۆ ئامانجەکانت تەنها کاتێك دەپێکێت لە ناخدا رەنگدانەوەیان هەبێت، چونکە بە گوێرەی بیردۆزەی هێزی راکێشانی دەروونی مرۆڤ تەنها لەو شتانە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت کە سەرنجیان دەداو دەیکاتە پرۆگرامی جێبەجێکردنی لە کاتە دیاریکراوەکاندا.

لە کوێن ئەو مەبەستو مەرامانەی کە ئەوان لە ژیانیاندا هەوڵی بۆ دەدەنو بەدوایدا وێڵن؟ ئەمەیە کەوا دەکات ئەنجامەکەی مرۆڤێکی سادە دەرچێتو لە ژیاندا نەزانێت چی بکات. لەبەرئەوە پێویستە هەرلە ئێستاوە چەند پرسیارێك لە ناخی خۆمان بکەین لەوانە ئێمە چیمان دەوێت؟ ئایا سەرکەوتن لەکوێوە دێتو مانای چی دەگەیەنێتو چۆن دەمان گەیەنێت بەمەرامو مەبەستەکانمان؟ چونکە گەر کەمێك لە ناخی خۆمان وردبینەوە دەبینین وەڵامی گشت ئەو پرسیارانەی تێدایەو تەنها پێویستی بەفەرمانو جوڵاندن هەیە. ناخی گشت مرۆڤەکانی سەر زەوی لەبنەرەتدا دەریایەك لە پرسیارو وەڵامو زانیاری لە خۆدەگرێت کە هەندێکیان لە ژینی رۆژانەدا مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت بە پێی پرۆسەیەکی سیستەماتیکی. مێشکی مرۆڤ زۆر فراوانە لە توانایدایە لە رۆژێکدا هەشتا ملیۆن زانیاری تۆمار بکات کە بێگومان ئەوە دەمان گەیەنێتە ئەو راستییە بەڵگە نەویستەی کە بەڵێ مێشکی مرۆڤ بوارێکی فراوانی هەیەو زۆر لەوە زیاترە کە ئێستا ئێمە بەکاری دەهێنین. بە پێی سەرچاوە زانستییەکان زۆرترین رێژەی مێشك کە لەلایەن مرۆڤەوە بەکارهاتبێت ٢٥٪ بووە لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە تەکنەلۆجیا چەند پێشکەوتووە! رادەی پێشکەوتن هەموو سنورەکانی عەقڵی بریووە، لەبەرئەوە ئێستا پێویستە بزانین کە چیمان مەبەستە لەژیاندا؟ بۆچی ئەو مەبەستەمان هەیە؟ کاریگەری چی دەبێت لەسەر ژیانمان ئەگەر ئەو مەبەستەمان هاتەدی؟

٣- بزانە کە سەرکەوتن پێویستی بە شیکردنەوەو وردەکاری ئامانجەکانی ژیانەوە هەیە:

پێویستە مرۆڤ لە ژیاندا رێرەوی خۆی هەبێتو هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو شتانە بدات کە لە ژیاندا نەخشەی بۆ کێشاون. ئەگەر سەیری ژیان بکەین دەبینین کە پریەتی لە کەوتنو هەڵسانەوە، لەبەرئەوە مرۆڤی براوەو سەرکەوتوو ئەو مرۆڤەیە کە خۆراگر بێت بەرامبەر بە لەمپەرەکانی ژیان.

٤- لە بەڵێندان لەگەڵ خودی خۆتو کەسانی دەوروبەرتدا راستگۆبە:

پێویستە مرۆڤ خاوەنی بەڵێنی خۆی بێتو هەرکاتێك مرۆڤ خیانەتی لە خودی خۆی یان دەوروبەری کرد بێگومان بە تێپەربونی کات مرۆڤێکی فاشیل دەردەچێتو نابێت چاوەرێی سەرکەوتن بکات، چونکە ئەو یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی سەرکەوتنی بەجێ نەگەیاند کە ئەویش بەڵێندانە.

٥- سەرکەوتن پێویستی بەکارکردنی راستەقینە هەیە:

کۆتا هەنگاوی سەرکەوتن بریتییە لە کارکردنو بیرکرنەوە زۆر بە وردیو بە دیقەتەوە. لەوانەیە زۆربەمان ئەو شتەمان بیستبێت کە بەسەر ئەنشتاین دا هاتووە، کاتێك ئەنشتاین لە یەکێك لە چێشتخانەکانی ئەمەریکا میوانی برادەرێکی دەبێت، ئەنشتاین دەیەوێت بچێت بۆ چێشتخانەکە، بەڵام بەدەم بیرکردنەوەوە دەروات کاتێك دەزانێت گەیشتۆتە قەراغی شارو وردە وردە بارانیش بەسەریا دەبارێت، بەڵام ئەو سەرقاڵی بیرکردنەوە بووە لە بابەتێکی ماتماتیکی! چەندان کەس هەیە کاتێك سەرقاڵی راپەراندنی کارێکە ئێمە بانگی لێ دەکەین ئاگای لێ نییەو وەڵام ناداتەوە، وادەزانین کە کەسێکی دەبەنگ بێت بەڵام لە راستیدا مرۆڤ لەکاتی کردنی هەرکارێکدا دەبێت هەموو هەستو بیری خۆی بخاتە سەر ئەو کارە.

ئێستا دوای جێبەجێکردنی ئەو هەموو هەنگاوانە بەرەو شارێی سەرکەوتن کەوتویتە رێ؟!

# دڵت لە خەم پاك بكەرەوە!

بەرزان ئەبوبەكر رەشید

زۆرن ئەو شتانەی دەبنە مایەی خەمو پەژارە بۆ دڵی مرۆڤ، بەڵام لەم ژمارەیەدا تەنها قسە لەسەر ئەم پەندە دەكەین كە دەڵێت: تەنها سێ شت زۆر كار لە دڵی مرۆڤ دەكات: (یەكەم/ كاتێك دەتەوێت بخەویت، بەڵام خەوت لێ ناكەوێت! دووەم/ چاوەروانی كەسێك دەكەیت، بەڵام تەشریف ناهێنێت! سێیەم/ كەسێك لە بیری تۆدا یەكەم كەسە، بەڵام تۆ لە بیری ئەودا دووەم كەسیت).

**كاتێك دەتەوێت بخەویت، بەڵام خەوت لێناكەوێت..** زۆرجار دەچیتە سەر جێگەی نووستن، تا كەمێك لە دنیای پڕ لە ناسۆروخەمو پەژارە داببڕێیتو چاوەكانت لێك بنێیتو ساتێك لە گرفتەكانی رۆژگار دووربكەوێتەوەو دەتەوێت بچیتە جیهانی خەووە تا ببێتە هۆی هێوركردنەوەی مێشكو ئارام بوونەوەی دڵو دەروونت، بەڵام خەوت لێ ناكەوێت، هەرچەند هەوڵ دەدەیت بێ سوودە!

ئەم حاڵەتە ئەگەر چی ناخۆشە بەڵام كاتییە، رەنگە نارەحەتییەكانی رۆژگارو كێشەو گرفتەكانت هۆكاری سەرەكی بن، هەر گرفتێك سەرچاوەكەی زانرا زۆر بە ئاسانی دەتوانیت چارەسەری بكەیت، تۆی بەرێزیش ئەگەر دووچاری ئەم حاڵەتە هاتیت، دەتوانیت بە هاوكاری كەسێكی دڵسۆزت كێشەكانت تاوتوێ بكەیتو هەوڵی چارەسەركردنی بدەیت، خۆ ئەگەر نەتتوانی بگەیتە ئەنجام بە خواردنی حەبێكی ئارام بەخش دەتوانیت چارەسەری گرفتەكە بكەیت، بە مەرجێك نەیكەیتە پیشەو خوی پێوە بگریت.

**چاوەروانی كەسێك دەكەیت، بەڵام تەشریف ناهێنێت..** رەنگە كەم كەس هەبێت دووچاری ئەم حاڵەتە نەبووبێت، بە تایبەت لە نیوەرۆیەكی گەرمی هاویندا، یاخود لە یەكێك لە رۆژە سەختەكانی سەرمای زستاندا، چاوەروانی هاورێیەكت كردبێ كە پێشتر بریار بووە پێكەوە كارێك ئەنجام بدەن، یان سەردانی نەخۆشێك بكەن یا... هتد، دوای چاوەروانییەكی زۆر تەشریفی نەهێناوە، تۆش زۆر نیگەران بوویتو كۆڵێك خەم چووە بە نێو دڵتا، ئەم حاڵەتەش زۆر ئاسان چارەسەر دەكرێت، جاری یەكەم لێی ببورە، جاری دووەم بۆ دواجار ئاگاداری بكە، ئەگەر لەوە زیاتر بوو ئەوە تەنها لۆمەی خۆت بكە، چونكە مرۆڤی ژیر هاورێیەتی كەسێك ناكات كە هیچ گرنگییەك بە بەڵێنەكانی نادات.

**كەسێك لەبیری تۆدا یەكەم كەسە، بەڵام تۆ لەبیری ئەودا دووەم كەسی..!** ئەوەی شوێنی تێرامانو هەڵوێستە لەسەر كردنە ئەم گرفتەیە، چونكە زۆرێك لە خەڵكان خاوەنی ئەم گرفتەن كە دڵ دەكات بە مەڵبەندی خەمو پەژارە، زۆر كەس هەیە لەم جیهانەدا كەسێكیان زۆر خۆشدەوێت، بەڵام بەرامبەرەكەی بەو شێوەیە خۆشی ناوێت، (كاتێك باسی خۆشەویستی دەكرێت، تەنها خەیاڵت نەچێت بۆ لای عاشقو مەعشوق، چونكە زۆر جار ئەو دوو كەسە رەنگە هاوسەر بن، یاخود دوو هاورێ بن، یا... هتد)، ئەم حاڵە یەكێكە لە گرفتەكانی ئەم رۆژگارە، رەنگە زۆر كەس بە دەست ئەم گرفتەوە بناڵێنێتو عەودالی چارەسەری گونجاو بێت، بۆ رزگار بوون لەو كێشەیە، بۆ چارەسەری ئەم كێشەیە بە پەندێك دەست پێ دەكەین: (هیچ كات

کەسێك مەکە بە یەکەم خۆشەویستی خۆت، کە تۆ لای ئەو دووەم خۆشەویست بیت!) لە ژێر رۆشنایی ئەم پەندەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە مرۆڤ نابێت کەسێك بکات بە رۆحو گیانو دڵی خۆی، لە کاتێکدا بەرامبەر هەمان ئەو هەستەی تۆی نەبێت! ئەم کێشەیە پەیوەندی بە هەستو نەستو شێوازی بیرکردنەوەی مرۆڤەکانەوە هەیەو رەنگە بە درێژایی شەوو رۆژ بیر لە بە دەست هێنانی خۆشەویستیو سۆزی کەسی بەرامبەر بکەیتەوە، کە تۆ کردووتە بە یەکەم کەس، بەڵام تۆ لە بیری ئەودا دەیەم کەسیش نیت، بۆ زیاتر زاڵ بوون بەسەر گرفتەکەتدا ئەم پەندەش بکەرە دروشمی ژیانت (خەمێکت بوێت کە تۆی دەوێت، خۆشییەکت نەوێت کە تۆی ناوێت)، ئەگەر تۆی ئازیز کەسێکی دووچاری ئەم کێشەیە هاتوویت، سەرەتا بزانە کە خۆت ئەو گرفتەت بۆ خۆت دروستکردووە، تەنها پزیشكو حەکیم کە بتوانێت لەو گرفتە قوتارت بکات خودی خۆتی! سەرەتا لە خۆت بپرسە: بۆچی کەسێکت کردووە بە یەکەم کەسی ژیانت، لە کاتێکدا تۆ نەك یەکەم دەیەم کەسیش نیت لای ئەو؟ ئەو کات ساتێك بیربکەرەوە! تاوانە رۆژانە کۆڵێك خەم دەکەیت بە نێو دڵو دەروونتداو ژەنگ بە دڵت هەڵدێنی!

دەڵێن: ئەگەر لە خەڵکی بپرسی: کێ هەژارە؟ هەموو بە یەك دەنگ وەڵامت دەدەنەوەو دەڵێن: هەژار ئەو کەسەیە کەماڵو سامانی نییە... تەنانەت خانوویەکی یەك نهۆمیشی نییە لەگەڵ خانەوادەکەیدا تێیدا بحەوێتەوە... هتد. بەڵام هەژاری راستەقینە ئەو کەسەیە کە بەدوای شتێکدا وێڵە کە هەرگیز پێی ناگات، روونتر بڵێین: دوای شتێك دەکەوێت کە بە دەستهێنانی زۆر ئاستەمە!

کەواتە لەمرۆ بە دواوە بە ئیرادەیەکی بە هێزو بەوپەری بروا بە خۆبوونەوە هەوڵ بدەو بەخۆت بڵێ: هەرگیز رازی نابم کەسێك یەکەم خۆشەویست بێت لە بیری مندا، بەڵام من لای ئەو دووەم کەس بم! ئەمەش بەوە دەکرێت کە خۆت بە کەم نەزانیتو دەروونت بە هێز بکەیتو بەسەر بیرکردنەوە نێگەتیفەکانتدا زاڵ ببیتو دڵت لە هەموو ئەو خەمانە پاك بکەیتەوە کە دەبنە هۆی ماندوو بوونو نارەحەتیو بێزاریت! چونکە مرۆڤی هەژار ئەو کەسەیە دوای شتێك کەوتووە کە هەرگیز نابێتە خاوەنی! مرۆڤی ژیر باش لە دونیا حاڵی بووەو دەزانێت دونیا چەند رۆژێکی کەمە (دوێنێ رۆیشتو ئەمرۆش دوای چەند ساتێکی تر خۆر ئاوا دەبێت، بیر لەسبەینێ بکەرەوە!)، کەواتە بەبیرێکی تیژو ژیرییەکی قوڵ خەمەکانت لابەرەوە لەشوێنیاندا خۆشیو شادی بروێنە.



# گوێزفرۆش!

**و/ بیلال باسام**

چوو بۆ لای گوێز فرۆشێكو پێی وت:

((دەکرێت هەموو گوێزەکانت بەخۆرایی بدەیت بەمن؟!))

گوێزفرۆش بە سەرسامییەکەوە تەماشایەکی کردو وەڵامی نەدایەوە.

دیسان پرسیاری کرد:

(دەکرێت کیلۆیەك گوێزم بە خۆرایی پێ بدەیت؟)

دوبارە بەبێدەنگی وەڵام درایەوە، پاشان تکای کرد لانی کەم یەك دانەی بە خۆرایی بداتێ.

تا دواجار گوێزەکەی وەرگرتو درێژەی پێدا:

یەکێك کە ئەرزشی نییە، دەکرێت دانەیەکی ترم بدەیتێ؟!

بە پێداگری دانەیەکی دیکەی وەرگرتو داوای کرد گوێزی سێهەمیش بە خۆرایی وەربگرێت.

گوێز فرۆشەکە تورەبوو، گوتی: زیرەکی؟!

کریارە ئینکارەکە وتی: راستییەکەی دەمویست وانەیەکت فێربکەم!

ئاخر تەمەنی ئێمەش بە هەمان شێوەیە!

ئەگەر پێت بڵێم هەموو تەمەنی خۆتم بە خۆرایی پێ بفرۆشە، بەهیچ نرخێك ئەم کارە ناکەیت.

بەڵام رۆژەکانی ژیانت دانە دانە بێ ئەوەی بەخۆت بزانی لەدەست دەدەیتو تا بە خۆتدا دێیتەوە، هەموو تەمەنت لەدەست چووە!

بەڵێ ئازیزم، ئاورێك لە دواوە بدەرەوە بروانە چەند سادە یەکە یەکەی رۆژەکانی ژیانتو لە راستیدا تەمەنی بەنرخت لەدەست داوە.

بەڵام دەمەوێت بزانی هێشتا کات درەنگی نەکردووە، تەنها ئەوەندە بەسە هیممەتێ بنوێنیتو بتەوێت لەمرۆ بەدواوە رۆژەکانت سود بەخشو بەکەڵك بن...

بەسە کە بخوازیت هەر رۆژێکت لە رۆژی پێشوتر لانی کەم جیاوازییەکی پۆزەتیڤی هەبێت.

بەسە کە نرخی چرکەساتەکانت بزانی، تا دیسان تەمەنت دەست بخەیتەوە...؟

س/ گۆڤاری شادکامی ژمارە ٣٤.

# جیاوازی لە نێوان وانەی تیۆری و مەشقی پراکتیزەیی

و: م/ صادق عوسمان

مامۆستایەك دەیویست كۆمەڵێك لاو ئامادە بكات بۆ شێوازێكی سەركەوتووی بانگەواز، بۆ ئاشناتركردنی خەڵك و ئامۆژگاری كردنیان، بۆ ئەم مەبەستە ماوەی شەش مانگی دیاریكرد كە وانەی تیۆرییان پێ بڵێت و دوای ئەوەش (٣) مانگ وانەی راهێنانیان بە شێوازێكی پراكتیزەیی و لە مەیدانی كرداریدا پێ بڵێت، لە نێو ئەو كۆمەڵە لاوەدا لاوێكیان كە زۆر بە سەركەوتوویی قۆناغی تیۆری بریبوو، داوای لە مامۆستاكەی كرد كە مۆڵەتی بدات دەست بە بانگەواز بكات، چونكە زۆر لە توانای خۆی رادەبینی و چاوەڕێكردنی بە لاوە ئاستەم بوو تا سێ مانگی دیكە، مامۆستا تكای لێكرد كە قۆناغی پراكتیزەیی تەواو بكات و مەشقی پێویست ئەنجام بدات، بەڵام لاوەكە لەسەر داواكەی خۆی سوور بوو، مامۆستاش بە ناچاری مۆڵەتی پێدا كە بچێتە قۆناغی جێبەجێكردنەوە.

لاوە تازە پێگەیشتووەكە بۆ ئەم مەبەستە رووی كردە گوندێكی گەورە بە مەبەستی بانگەوازو پەروەردەكردنی خەڵكی و فێركردنی منداڵانی گوند، كاتێك گەیشتە گوندەكە كاتی نوێژی هەینی بوو، ئەویش رووی كردە مزگەوتی گوند بۆ بەجێهێنانی نوێژی هەینی، ئەوەی جێگەی تێرامانی ئەم لاوە بوو ئەوە بوو بینی وتاربێژ زانیاری هەڵەو هەڵبەستراو بە نوێژخوێنان دەگەیەنێت! بۆیە خۆی پێرانەگیراو لە كاتی وتارەكەدا هەستاو رووی كردە خەڵكەكەو وتی: ئەم وتاربێژەی ئێوە كەسێكی درۆزنەو نەزانەو درۆ بە ناوی خوداو پێغەمبەرەوە دەكات، لێرەدا وتاربێژەكە نوێژخوێنەكانی لێ هەڵناو وتی: ئەم گەنجە بێ باوەڕەو دەستدرێژی دەكات، جەماوەرەكەش پەلاماریان داو زۆریان لێداو برینداریان كرد!!

پاشان گەنجەكە بەم حاڵەوە گەڕایەوە بۆ لای مامۆستاكەی و بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، پاش هەفتەیەك هەمان لاو لەگەڵ مامۆستاكەیدا چوونەوە هەمان گوندو بەشدارییان لە نوێژی هەینیدا كرد، كە هەمان وتاربێژی پێشوو وتاری دەخوێندەوەو بەردەوام بوو لەسەر هەڵەكانی پێشووی، كاتێك لە وتارەكەی بووەوە، مامۆستای گەنجەكە هەستاو بە نوێژخوێنانی گوت: ئەم مامۆستایەی ئێوە زانایەو لە دۆستانی خودایە، هەر كەس تاڵێك لە ریشی ئەوی لابێت دەبێتە مایەی بەرەكەت بۆی!

كاتێك خەڵكەكە گوێبیستی ئەو وتانە بوون كەوتنە لێكردنەوەی ریشی وتاربێژەكەیان و دەستیان كرد بە رنینەوەی تا رووومەتی خوێناوی بوو، لێرەدا مامۆستاكە لێی چووە پێشەوەو بە چرپە پێی وت: سزای زیاترت دەوێت یان كۆتایی بە قسەی هەڵبەستراو دێنی؟ ئەویش لە كاری خۆی گەیشت و بەڵێنیدا بە مامۆستاكە كە ئیتر زانیاری هەڵەو هەڵبەستراو بڵاو نەكاتەوە. بەم شێوەیە گەنجەكە هەستی كرد كە وانەی تیۆری بێ راهێنانی پراكتیزەیی ئەنجام ناپێكێت، پێكەوە لەگەڵ مامۆستاكەی گەڕانەوەو ملكەچی بەشداربوون بوو لەو مەشقەدا.

سەرچاوە/ دلیل التدریب القیادي/ طارق السویدان.

# سەركەوتن

ئا/ كیوان رزگار عبدال

* بۆ پێشكەوتن و سەركەوتن سێ ش
پێویستە: یەكەم/ ئیرادە، دووەم/ ئیرادە، سێیە
ئیرادە. (لۆرد ئاڤیۆری).
* خۆشییەكان شادی و ئارامی ناهێنێتە د
بەڵكو ئەوە سەركەوتنەكانە شادی بەدڵ و ئارا
بەدەروون دەبەخشێ. (رولكیرت).
* كۆشش بۆ گەیشتن و سەركەوتن لە خو
سەركەوتن خۆشترە. (گۆتە).
* لە ناپلیۆنیان پرسی چۆن توانیت سەركەو
بۆ سوپاكەت بەدەست بێنی؟ وتی بەسێ ش
ئەگەر یەكێ بیگوتایە ناتوانم دەمگوت: هە
بدە، بیگوتایە نازانم، دەمگوت فێربە، بیگوتا
مەحاڵە، دەمگوت تاقی بكەرەوە.
* یەكەمین مەرجی سەركەوتن ئازایەتی
بوێرییە. (كامبل).
* كەسانی بەدگومان و دوو دڵ هەرگیز
كارەكانیاندا سەركەوتوو نابن. (ناپلیون).
* سەركەوتن بۆ ئەو كەسانەیە كە زیا
خۆراگری دەنوێنن. (ناپلیۆن).
هیچ شتێك بە ئەندازەی پشوو درێژی
لەسەر كەوتن نییە.(پەندی چینی).
* مرۆڤی سەركەوتو وەك درێل كاردەكا
بەو شێوەیەی كە هەموو مێزی خۆی لەس
یەكخاڵدا كۆ دەكاتەوە. (دیل كارنگی).
* ئەگەر یەكێك قوربانی نائومێدی نەبێ،
كۆتاییدا سەردەكەوێ. (ئەبراهام).
* رەمزو كلیلی سەركەوتنەكان ئیرادەی
(رۆبرتسۆن).
* من هەموو سەركەوتنەكانم قەرزا
ئەو ئومێدانەم كە لە قۆناغی لاوێتی لەدڵم
چاندبووم. (ناپلیۆن).
* بێ ئۆقرەیی كۆسپێكی گەورەیە لە رێگ
سەركەوتندا. (ناپلیۆن).
* نهێنی سەركەوتن لەخۆ راگریدای
(دیزرائیل).
* ئەو سەركەوتنانەی مرۆڤ بەدەست
هێناوە، بە گشتی بەرهەمی پشوو درێژی
تەحەممول كردن بووە. (شكسپیر).
* بۆ هەڵكشان بەرەو سەركەوتن دەبێ
یەكەم پەیژەوە سەركەوێ. (پەندی ئینگلیزی)
* ئەو رۆژەی پشوو درێژی لە باخی ژی
روا، ئومێدت بەلێكردنەوەی میوەی سەركەو
هەبێ. (ئەڵمانی).
سەرچاوە/ ١ - كتێبی وتە پرشنگدارەكا
ژیان/ ئامادەكردنی فریاد بارزانی.
٢- كتێبی وتە نەمرەكان/ ئامادەكرد
وەرگێڕانی هاوار حاجی كریم.

# منی قەڵەم

یوسف واژەیی

منی قەڵەم لەوەتەی هەم بەبێ ئەوەی هەست بە ماندوێتی بکەم، خزمەتم بۆ تۆی مرۆڤە. چی لە ناو دەماخو ناخی تۆدا هەیە کردوومەتە راڤەو شرۆڤە.

زۆر لە مێژە خزاومەتە نێوان پەنجەکانی تۆوە، نەك بێ مەبەستو لە خۆوە، بەڵکو چی جوانیو بە سوودە دیاری ژیانەو سرودە، کە سەرجەم مرۆڤایەتی دەکا خۆشبەختو ئاسوودە، بنووسمەوە.

منی پێنوس لەوەتەی کە تۆ مرۆڤی هەر ئەنوسمو نانوسێمو ناتوێمەوەو ناخوسێم، لەگەڵ دەفتەری هاورێما لەگەڵ کتێبی نەوەما بە هۆی شیلەی گوشراوی ناو هەناوی تۆ، بە تواناو تینو تاوی تۆ، بە ئەسرینی وەکو یاقوتی مەرەکەب، زانستو هونەرو ئەدەب، تۆمار ئەکەم بەم زمانە زۆر بچووكو تیژەمەوە هاوار ئەکەم، ئەو گەلەی کە دواکەوتووە، پار کەوتووە خەوی قورسی بێ ئاگایی لێ کەوتووە، بێدار ئەکەم.

رشتەی مێژووی دوورودرێژی ئینسانی چی ئەینوسێتەوە؟ نوکم کۆڵەکەو پایەی بەهێزی شارستانی منی قەدو باڵا باریكو بچووکم.

شاعیرانو ئەدیبانت فرمێسكو قوڵپی گریانو هەناسەو تاسەی خۆشیان، بەزاری من هەڵ ئەرێژن، تەپوتۆزی چیرۆکی دیرۆکی کۆنو رووداوی نوێ بە دەستی من بێژن. لە دایکبوونی رۆژی نوێ بە من پیرۆزبایی دەکەن، تێیدا شادیو شایی دەکەن دوێنێش هەر بە من دەنێژن.

منی خامە چ مەیدانێ هەیەو کامە کە جێ پێویستیو مەرامە ئەسپی خۆمی تیا تاو ئەدەم، لە کوێ باسو خواسێ هەیە، شیکارو پێناسێ هەیە، کە من دەمی تێ وەر نەدەم.

چەندین مەردو کەڵە زانا نەبەردو بە تواناو دانا بۆوەی هەگبەی توێشوو پڕ کەن، لە ژێر سایەو چەتری منا بارگەو بنەی خۆیان دانا.

بەرێوەبردنو رامیاری، زانستی کیمیاو بیرکاری، لە ناو ژێرخانی ئابوری، لەسەر خانی رۆشنبیری، مرۆڤ هەر منم لە بیری.

من داردەستی قوتابیانو فێرخوازی زانست خوازم، لە ئاهەنگی هەموو فێرگەیەکی ژینا خاوەنترین ئاوازم، ئەو کەسەی کە ئاشنایەتی لەگەڵ تاقە پیتێك هەبێ، لەگەڵیا خاوەنی رازم.

تەنانەت پەروەردگاریش یەکەمین کۆمەڵە دیاری کە بۆ پەیامبەرەکەی خۆی رەوانەکردو داباری ناوی منی تیا هێناوە ئیتر چۆن بەخۆم نە نازم؟

من چەکی دەستی رووناکیم دژی تاریکیو شەوەزەنگ لە ژوور سەری خەولێکەوتوو بوومەتە زەنگ، من سەرکردەی شۆڕشێکم لە دژی نەخوێندەواری کەوتوومە جەنگ. بەڵام ئەی مرۆڤی هاورێم کە تۆ خاوەن ژیریو ژیاری منی، بچووك بۆ تۆ کراوەتە دیاری بۆ ئەوەی لە تۆ گەورەیی تا پیاوی زەمانی خۆتو ئەم دەورەبی، تکام هەیە هەزار تکا با هاورێی راستەقینە بین لەگەڵ یەکا، بە ناحەقی مەم گریەنە، فرمێسکم پێ مەرژێنە، بۆ ئاشوبو یەکتر کوشتن، جەنگوخوێنی یەکتر رشتن، هەرگیز بەکارم مەهێنە دام مەهێنە، من بە هەمیشە داهێنان بۆ داهێنان دەمەزەردم لە پێناو خزمەتم بە تۆ توشی ئاخو دەردم، کەواتە با پەیامی من هەر ئاشتی بێ، ئازادی بێ، بەختەوەری بێ شادی بێ.

تا پێکەوە ببینە هەوێنی ژیان دوور لە زیان — خاڵی لە ستەمو جەورو نادادی بێ..

# قەڵەم

ئازاد محی الدین/ خورماڵ

سوێند بەو خوایەی سوێندی پێ خواردی
بە سورەی قەڵەم بۆ ئێمەی ناردی
قەرزاری تۆیە گشت خوێندەوارێ
حەقی پێویستت پێ نەدرا جارێ!
تۆ هەڵسوراوی بە خواستی نوسەر
پیتو وشەو دێر لاپەرەو دەفتەر
لە بۆ حەق نوسین چەند جار شکاوی
ئای بۆ ناحەقی تۆ هەڵسوراوی؟
بۆ هەموو گەلێك بەهەموو زمانێك
لە بۆ یەقینو بۆ گشت گومانێك!
بە گشت ئاوازێ بە هەموو رەنگێ
لە کاتی ئاشتیو لەهەموو جەنگێ
بە شەوو بە رۆژ هەموو کاتەکان
ئەمرۆو دوێنێ هەم پێش بینییەکان!
جارێك شیوەنو رۆ رۆیەو گریان
یا پێکەنینی بێ عاری لە ژیان!
جارێك وەك رەخنەی نادروستانە
بەڵێنی درۆی پڕ بەم جیهانە!
جارێك بە وێنەو شێوەو هاوشێوە
دەم بەسی دەعباو ساحیرو دێوە!
جارێ ئیلهامەو شیعر دێتە گۆ
خاڵ بەندی ئەکا یاسای مافی تۆ!
جارێك چەواشەو ساختەکارییە
لە داهێنانی گەمەو یارییە!
جارێك سەرقاڵە بە چەکی ئەتۆم
قەڵەم دووبارە سوێندت بۆ ئەخۆم!
جارێك نەخشەیەو جوگرافیای جیهان
پەردە لادانە لەسەر رووی پەنهان!
جارێك حیسابی دەفتەرو بلۆکە
پڕو پاگەندەی ئامێری لۆکە!
ئەوەی پێت کرا هەمووی ئەزانی
ئەوەش پێت ئەکرێ بچێتە بانی!
چۆن نەتوایتەوە چۆن نەبوویت بە گەرد؟
چۆن ئارامت گرت لە دەستی نامەرد؟
گشت خوێندەوارێ بە تۆ ئەوێرێ
من لێت ئەترسم زیاتر لە شێرێ
تا دڵنیا نەبم لە ئارامی تۆ
پەنجەی نوسینت ناخەمە ئەستۆ!
قەڵەم ببورە بینایی چاوم
سوپاس بۆ خوا کە تۆی پێ داوم!

# پێناسەکانی خۆم

ئا: دلێرحمدامین إبراهیم / هەریر

بەدبەخت: کەسێکە متمانەی بە کەس نەبێ لەبەر خراپی گومانەکەی، کەسیش متمانەی پێ نەبێ لەبەر خراپی کردەوەکانی.

کار بەجێی دانایی: گەورەترین بەخششە بۆ مرۆڤ، بەڵام شوێنەکەی لەلای مرۆڤی نەزان وەکو شوێنی زێڕو گەوهەر وایە لەسەر پشتی گوێ درێژ.

زانست: وەکو زێڕو ئاڵتون وایە لە ناو خڵتەکەیدا دەرناکەوێ تا پاکی نەکەینەوە بە ئاگر.

مرۆڤ: تاکێکی مردووە ئەگەر کارێکی وا نەکات دوای مردن بە زیندویی بمێنێتەوە ئەوا دووجار دەمرێ.

دەوڵەمەند: خۆشاردنەوەیە لە هەژاران، سەرقاڵبونی زۆرو بەفیڕۆدانی کاتە بۆ بەجێمانی سامانێکی زۆر لە دوای خۆی.

هاوڕێی چاك: ئەو کەسەیە کە لە پاش ملەش هەر هەمان خۆشەویستی بۆ تۆ هەبێ کە بەرەو رووی تۆ هەیەتی.

بەڕێز: کەسێکە کە ڕێز لە هەژاران بگرێ، وەکو چۆن ڕێز لە دەوڵەمەندو سەرمایەدارەکان دەگرێ.

بەختەوەری: شتێکە عەقڵ بە دەستی دێنێ بە هۆی زانستو زانیاری، بەڵام هەرکاتێك نەفس شەیدای عەقڵو زانست بێت ئەوا دەبێتە حیکمەتو دانایی.

نابینا: ناخۆشترین شت بۆ نابینا، کە زۆر لێی بترسێ کەوتنە ناو بیرێکەو زامدار بونیەتی، بەڵام مرۆڤی نەزان لە ناو بیری ناخۆشی ژیاندایە تا ئەبەد.

نوستنو مردن: نوستن مردنێکی کورتە، مردنیش نوستنێکی درێژ خایەنەو خۆی بۆ ئامادە بکەو بە سادەو ساکاری سەیری بکە، چونکە تاڵییەکەی لە ترسەکەی دایە.

کات: دابەشی بکە بۆ سێ بەش/ بەشی یەکەم: داوای عەقڵێکی چاك بکەو کاری بۆ بکە، بەشی دووەم: بەردەوامو سووربە لەسەر عەقڵی کارا تا مردن، بەشی سێیەم/ بەم عەقڵە کارایە ئیش بکە بۆ عاقڵکردنی شەڕانگێزو شەڕخوازو بێ عەقڵەکان.

بێ ئاگا: کەسێکە کە زانستی هەیە بەڵام پراکتیزەی ناکات لە ئەمری واقیعدا، بۆیە ئەم زانستە وەکو دەرمانێك وایە لای نەخۆشێك بەڵام خۆی پێ تیمار نەکات.

پیری: بەهۆی تورەبونو ئیرەیی بە دەست دێت، بەرهەمی هەردوکیشیان خەمو خەفەتە.

چاکە: هەرکەسێك بانگەشەی چاکە دەکات با خۆی لە خراپە بپارێزێت، ئەگینا هیچ مانایەکی نییە تەنها بانگەشە نەبێ بۆ خراپە.

راستگۆیی: کەسێکە کە دان بەعەیبو عارەکانی خۆی دابنێ، دوورکەوێتەوە لەو شتانەی کە پەیوەندییان بەوەوە نییە.

بەخشندە: کەسێکە کە پاكو بێ گەردو سادەبێت، لە خراپەی کەسانی تر خۆش بێ لەکاتی بوونی دەسەڵاتت بەسەریدا.

پیری ئاخر خێر: کەسێکە کە خۆی بۆ ئامادەکردبێ وەکو چۆن خۆی بۆ زستان ئامادە دەکات، لەو سەرماو سۆڵەی کە هێرشی بۆ دێنێ، خاوەنی بڕیارو پڕۆژە بێت تا مردن.

بەڵاو موسیبەت: هەموو شتێك لە بچوکی دەست پێ دەکات پاشان گەورە دەبێت، بەڵام بەڵاو موسیبەت لە گەورەیی دەست پێدەکاتو پاشان بچووك دەبێتەوە.

ویژدان: دەنگێکی هێمنە پێت دەڵێ: لە سنوری خۆت دەرمەچۆ..! چونکە کەسێك هەیە بە وردی چاوی لێتە.

ئاو: ژیان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، یەك دڵۆپ ئاو بەرد کون دەکات...! نەك بە توندوتیژی، بەڵکو بە دوبارەکردنەوەو بەردەوامیو کۆڵنەدان.

بێ ئومێدبوون: هەرەس هێنانو کەوتنت نەنگیو عەیبو عاری نییە، بەڵکو ئەوە نەنگیو عەیبوعارە ئەگەر نەتوانیت هەڵسیتەوە، چونکە تا ڕێگاکانی سەرنەکەوتن نەزانی، فێری سەرکەوتن نابیت.

# ڕابردوو و ئێستاو ئاینده!

زاهیر زانا

کاتێك لەبارەی رابردوو و ئێستاو ئایندەوە دەدوێین، کارتێکەری سەرەکیو بناغەی پۆلێنکردنی ئەم دەستەواژەیە زەمەنەو رۆڵێکی کاراو گرنگی هەیەو باگراوندی تەواوی ژیانی ئێمەیەو سوتەمەنیو خۆراکمانە، رابردوو هەموو ئەوانەیە کەتێپەرینو ئیتر ناتوانین رۆڵێکی بەرچاوی تێدا بگێرین، ئێستا کاتی فرمانو جوڵەو کارکردنەو دەبێت پەرەی ژیانی تیا بنەخشێنینو هەنگاوی تێدا هەڵبگرینو کاری رێكوپێكو ناوازەی تیا ئەنجام بدەینو بەردی تیا بخەینە سەر بەرد، تا قەڵای ژیانێکی ئاسودەو ئارامو رێكوپێکی تیا بنیاد بنێین، ئاینده هەڵگری هەموو ئەو نەخشەو پلانو ستراتیژانەیە کەبۆ داهاتووی ژیانمان دەیکێشینو کێشاومانەو بەشێك لە ئامانجو هیواو خەونەکانمانی لە خۆگرتووە، دەبێت بزانین بەشێکی زۆر لە هۆکاری سەرکەوتنی سەرکەوتووەکان باش مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەم سێ زەمەنەداو بەشێك لەشکستی شکستخواردوان گوێنەدانە بەزەمەن بەهەرسێ بەشەکەیەوە، مرۆڤ ناتوانێت بێ رابردوو بژی، چونکە بەشێکی ئێستای رابردووی دروستیکردووەو هەر زانستو نەتەوەو مرۆڤێکیش رابردوویەکی تایبەتی خۆی هەیەو بۆتە بەشێك لەئەزموونیو شانازیو ژیانی، بەلام ئەمە ناکاتە ئەوەی ئێمە لەرابردوودا بژین، چونکە ئەگەر لەرابردوودا ژیاینو لە ئێستا دوور کەوتینەوە بەرەو خەیاڵو خەموپەژارە دەرۆینو وامان لێدێت تەنها ئاه بۆ رۆژە سەختەکانیو خۆزگەش بۆ رۆژە خۆشەکانی هەڵبکێشینو لە واقیعمان دوور دەخاتەوەو لە ئێستامان دادەبرێتو کارکردنمان کەم دەبێتەوە، بەپێچەوانەوە بە کاری رێكوپێكو سەرکەوتوانەی ئێستامان دەتوانین رابردووشمان رێك بکەینەوەو هەست بە ئارامییەکی زیاترو دەروونێکی درووستتر بکەین، هەمیشە لە ئێستادا بژیو هێزو تواناو لێهاتوییەکانت کۆبکەرەوەو بەوپەری چالاکیو حەزەوە بۆ ئامانجو هیواکانت تێبکۆشە تا ئاستەنگەکانی سەر رێگات لاوازو بێ هێزو پەرتەوازەبنو واقعیترو نزیکتر بیت لەو باردۆخەی تێیدا دەژیت، بۆ هەر کارێك ئێستا دەست پێبکەو ئاینده هەگبەی پرهیواو ئاواتو ئامانجت بێو نەخشەو پلانی بۆ بکێشە تا لە ئاییندەدا سەرلێشێواو و بێ بەرنامە نەبیتو ئاراستەی ژیانی خۆت خۆت دیاری بکەیتو بەرەو ئەو ئامانجانەی دەتەوێت بەسەر ئەو پلیکانانەدا سەر بکەویتو رێگا بگری بەرەو ژیانێکی باشترو.. بەختەوەرییەکی زیاترو.. ئایندەیەکی روونترو.. داهاتوویەکی گەشترو مێژوویەکی زێرینتر، چونکە ئەمرۆ مێژووە بۆ سبەینێو بناغەیەکی پتەویشییەتی، ئەمرۆت بنەخشێنەو بیرازێنەرەوە بە کاری جوانو نایابو بەسود بۆ خۆتو مرۆڤایەتی بەسود وەرگرتن لەو هەموو توانا شاراوانەی خودی خۆت کە بە پەیبردنو بەکارهێنانیان هەموو دەرگاکان دەکەیتەوەو هەموو سنورەکان دەبەزێنیت، بۆ ئەوەی کەسایەتییەکی دروستو سەرکەوتوو بین پێویستە لەئێستادا بژینو سود لە رابردوو وەربگرینو بۆ داهاتووش پرۆژەو بەرنامەمان هەبێت.



## گەورەترین دەرمان!

جارێك پاشای وڵاتێك داوای لە زاناو بیرمەندو حەکیمەکانی وڵاتەکەی کردو وتی: کێ لە ئێوە دەتوانێت شوشەیەکم بۆ بهێنێت کە پڕ بێت لە گەورەترینو باشترین دەرمان، تا باشترین خەڵاتی بکەم، ئەم داوایەی پاشا بە نێو شاردا بڵاوبوویەوە، خەڵکی شار لە نێو خۆیاندا (٣) زانایان هەڵبژاردو ئەوانیش هەریەکەیان شوشەیەکی پڕ لە دەرمانیان لەگەڵ خۆیاندا بردو بەرەو کۆشك بەرێکەوتن.

زانای یەکەم/ شوشەیەك ئاوی پێبوو، چووە بەردەمی پاشاو پێی وت: جەنابی پاشا ئاو نیشانەو سەرچاوەی ژیانەو هیچ بوونەوەرێك لەم جیهانەدا بەبێ ئاو ناژی.

زانای دووەم/ شوشەیەك هەنگوینی پێبوو، ئەویش وتی: بەڕێز پاشای وڵات، هەنگوین شیفایەو سەرچاوەی چارەسەری زۆربەی نەخۆشییەکانەو خواردنی تەواوی ئادەمیزادە.

زانای سێیەم/ شوشەیەك مەرەکەبی پێبوو، وتی: جەنابی پاشا مەرەکەبو قەڵەم ئادەمیزاد بە هۆیانەوە دەتوانێت بنووسێو بخوێنێو فێر ببێت، کە دەرمانی عەقڵو گیانە.

پاشا بە وەڵامی زانای سێیەم سەرسام بوو! هەر بۆیە وتی: زۆر راستە داناییو ژیانی گەلانو بەختەوەرییانو پێشکەوتنیان بەهۆی زانستەوەیە، کەواتە زانست گەورەترین دەرمانە! فەرمانیدا دیارییەکی بە نرخ پێشکەش بە زانای سێیەم بکەن!

# وانەیەك لە كیسەڵەوە!!

منداڵێك كیسەڵێكی هەبوو زۆری خۆش دەویستو كردبوویە هاوڕێی خۆی یاری لەگەڵ دەكردو خواردنیشی دەدایە، شەوێك لەشەوە ساردەكانی وەرزی زستان منداڵەكە هەروەك جارانی پێشوو هاتەلای كیسەڵە خۆشەویستەكەی، بینی چووەتە ناو بەرگە رەقەكەیەوەو نایەتە دەرەوە هەتا برێك گەرمی بێتەوە.

زۆر هەوڵیدا لەگەڵی، بەڵام كیسەڵ سەرپێچی كردوو رازی نەبوو هەرچەندە بەدارێك لێی دەدا بەڵام كیسەڵەكە گوێی پێ نەدەدا، بۆیە منداڵەكە هاواری كرد بەسەریدا ئەمجارەش بێ هودە بوو زیاتر كەللەرەقی كردو نەهاتەدەرەوە.

لەو كاتەدا باوكی هاتە ژوورەوە بینی منداڵەكەی زۆر تورەیە، لێی پرسی چی بووە كورم؟

ئەویش باسی بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ كیسەڵی هاوڕێی بۆ گێڕایەوە.

باوكی زەردەخەنەیەك گرتیو پێی وت: كورم وازی لێ بێنە، وەرە با بڕۆین، پاشان باوكی لە نزیك كیسەڵەكە ئاگرێكی كردەوەو لەپاڵیا لەگەڵ كورە بچوكەكەی دانیشتنو كەوتنە گفتوگۆ، لەم كاتەدا كیسەڵەكە بەرەبەرە لێیان نزیك بووەوە تا زیاتر گەرمی بێتەوە.

بەزەردەخەنەیەكەوە بە كورەكەی وت: كوری شیرینم خەڵكی وەك ئەم كیسەڵە وان ئەگەر ویستت رای تۆ پەسەند بكەنو لە رای خۆیان پاشگەز ببنەوە، پێویستە بەسۆزو خۆشەویستی خۆت گەرمیان بكەیتەوەو رقیان هەڵمەسێنە بەكردنی كارێك بە تورە بوون یان زۆر لێكردنو ئازاردان.

ئەمەش نهێنی كەسانی سەركەوتووو كاریگەرە لە ژیاندا، ئەوان پاڵنەرن تا سۆزو خۆشەویستیو رێزی كەسانیتر بەدەست بهێننو گوێرایەڵیان دەبن لە رێی بەخشینی هەستو سۆزی گەرمی دڵیان بۆیان.

پەندێكی ئینگلیزی دەڵێت: «دەتوانیت وا لە ئەسپەكەت بكەیت كە بچێتە سەر ڕووبارێك، بەڵام ناتوانیت وای لێ بكەیت كە لێی بخواتەوە»!

مرۆڤیش بەهەمان شێوە، دەتوانیت بیانترسێنیتو ئازاریان بدەیت بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی هەتە، بەڵام هەرگیز ناتوانیت وایان لێ بكەیت كە خۆشیان بوێیت، بێجگە لە رێی مامەڵەكرن لەگەڵیان بە هەستێكی گەرمو دڵێكی بێ خەوشو رۆحێكی خاوێنەوە نەبێت.

دڵت ئەو موگناتیسەیە كەخەڵكی بەرەو خۆی كێش دەكات بۆیە شتێك كە روون نەبێت یان ببێتە مایەی ئاڵۆزیو تێنەگەیشتن مەخەرە نێوان دڵی خۆتو بەرامبەر.

لەبیرت بێت خەڵكی وەك ئەو كیسەڵەن..... بۆ گەرمی دەگەرێن.

ئەحمەد مستجاب دەڵێت: « تەنانەت هاورێیەتی پێویستی بە بەهرەیە بۆ پاراستنو پارێزگاری لێكردنی».

بەو هیوایەی بتوانین موگناتیس ئاسا كەسانیتر كەمەندكێش بكەینو ببینە مایەی ئاسوودەیی بۆیان، نەوەك ببینە نەگەیەنەرێكو هۆكار بین بۆ دووركەوتنەوەو هەڵهاتنیان.

سەرچاوە: أفكار صغيرة لحياة كبيرة.




و: مافناس- ئیبراهیم بەهائەددین ئەحمەد

# کلیلی سەرکەوتن

سەرەتای داهێنان هەمیشە بیرۆکەیەکی سادەیە، ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی متمانەی بەخۆی هەبوو نەخشەو پلانی تایبەتی بۆ دانا، گومانی تێدا نییە سەرکەوتن بەدەست دێنێت. هەرچەندە هەموو بیرۆکە نوێیەکان سەرەتا لە لایەن کەسانی ترەوە گاڵتەی پێدەکرێت و لەوانەیە هەندێجار دژایەتی بکرێ، هەر لەبەر ئەوەش پیادەکردنی بیرۆکە نوێیەکان کەسایەتییەکی توندو متمانە بەخۆ بوونی دەوێت، بۆ ئەوەی بتوانیت بەردەوام بیت لە هەوڵ و کارکردنی بێ وچان بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکەت. هەر لەبەر ئەو هۆیانەش دەبینین کە ئەو کەسانەی لە مێژوودا سەرکەوتنیان تۆمارکردووە لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیان، بە رادەیەك سوور بوون لەسەر بەدیهێنانی ئامانجەکەیان و بەرادەیەك متمانەیان بە خۆیان هەبووە کە جێگەی تێرامان بووە.

سووربوون لەسەر کارکردن و بەردەوام بوون لەسەر تێکۆشان و زاڵبوون بەسەر کۆسپ و تەگەرەکان و بڕوا بەخۆبوون بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانج، ئەمانە بریتین لە بنەما سەرەکییەکانی سەرکەوتن.

کۆمپانیای ستاربکس کۆفی لە ساڵی ١٩٧١ دەست بەکاربوو لەکاتێك کە سێ فرۆشیار دەستیان کرد بە فرۆشتنی قاوەی سەوز لە (سیاتل بایك بلیس مارکت)وە ناویان لە کۆگاکەیان نا (ستاربکس) دواتر سێ شوێنی فرۆشتنیان دابینکرد بۆ کڕیارەکانیان، لە ساڵی ١٩٨٢ داوایان لە گەنجێك کرد کە ناوی (هوارد شولتز) بوو کە ئەویش فرۆشیارێکی کارامەبوو، کە چەند شوێنێکی فرۆشتنی قاوەی سەوز بەڕێوە ببات بۆیان، شولتز ئەو کاتە لە تەمەنی ٢٩ ساڵی دابوو. ئەویش شاری نیورکی بەجێهێشت و بەرەو سیاتل بەڕێکەوت.. دوای ساڵێك شولتز سەفەری کرد بۆ ئیتالیا بە مەبەستی کڕینی کەل وپەل. لە کاتێکدا لە گۆڕەپانی بیبازا دەسورایەوە لە شاری میلانۆ بیرۆکەیەکی بۆهات: لەبەرخۆیەوە وتی: ئەو پەیوەندییەی ئیتالییەکان دەبەستێتەوە بە قاوەخواردنەوەو ڕۆمانسیەتی ئەو خواردنەوەیە بە جۆرێکە کە تاکی ئیتالی ڕۆژی خۆی بە قاوە خواردنەوە دەست پێدەکات و لە قاوەخانەکەدا هاوڕێکەی دەبینێت، دەکرێت لە ئەمەریکا هەمان کار پیادە بکەین هەرچەندە پێشتر کەس ئەو کارەی نەکردووە.

شولتز هەستا بە کردنەوەی زنجیرە قاوەخانەکانی ستاربکس لەسەر شێوەی قاوەخانەکانی ئیتالیا. هەرچەندە سەرۆکەکانی شولتز دوودڵ بوون لەسەرکەوتنی ئەم بیرۆکەیە، چونکە وایان دەزانی کە هێزی کۆمپانیاکەیان لە فرۆشتنی قاوەی سەوزدایە... بیرۆکەی بەڕێوەبردنی قاوەخانەیان لا پەسەند نەبوو. بەڵام شولتز نەخشەیەکی تەواوی بیرۆکەکەی ئامادەکرد، بە باوەڕێکی بە تینەوە پابەندبوو بە جێبەجێکردنی، هەتا وای لێهات ستاربکس بوو بە زنجیرە قاوەخانەیەکی تایبەتمەند کە پێشەنگ بێت لە ئەمەریکا، بەجۆرێك کە لە هەر شارێك دەچیتە ژوورەوە قاوەخانەکان ڕووبەڕووت دەبنەوە بەر لەوەی بچیتە شارێکی تر. ئەوانی تر وایان دەزانی کە شولتز ڕووبەڕووی زیانێکی ئابووری گەورە دەبێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە قازانجێکی ئابووری گەورەی بەدەست هێنا.

شولتز لە مێشکی خۆیدا داینابوو کە سەدان قاوەخانەی ستاربکس ببن بە وێستگەیەك بۆ فەرمانبەران لە ڕێگایان بۆ چوونە سەر کار پاشان کە دەگەڕێنەوە بۆ بە یەکگەیشتنیان لەگەڵ هاوڕێیانیان. هەروەها فرۆشیارەکانیش دەیکەن بە وێستگەیەك بۆ حەوانەوەی ماندوو بوونیان دوای تەواو بوونی کار لە کۆگاکانیان. جگە لەوەی گەنجەکان ژووانیان لە قاوەخانەکاندا دەبەستن بۆ بە یەکتر گەیشتن لەگەڵ خواردنەوەی فنجانێك قاوە لە بری خواردنەوە کهولییەکان. هەروەها خانەوادەکانیش ڕووی تێدەکەن بۆ خواردنەوەی فنجانێك قاوەی بە سوود ئەو کارەی شولتز کردی دەری دەخات کە:-

١- کاتێك ئەو کارەی کە دەتەوێ بیکەی ئەگەر هاتوو نەخشەی تەواوت بۆ کێشا لە دیدی خۆتداو بڕوایەکی بەهێزت بە خۆت هەبوو لە جێبەجێکردن و ئەنجامدانی هەرکارێك ئەگەر قورسیش بێت ئەوە دڵنیابە سەر دەکەویت.

٢- بیرۆکەی نوێ پێویستی بەکات هەیە بۆ ئەوەی لە لایەن کەسانی تر قبوڵ بکرێت... ستاربکس... کاتێکی ویست تا گەیشتە بەدیهێنانی قازانج لەم بیرۆکەیە.

٣- تەنها بە خزمەتکردنی باش و پێشکەشکردنی بەرهەمی نایاب دەتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنی و قازانجت هەبێت، شولتز باشترین کەسانی هەڵبژارد بۆ بەڕێوەبردنی قاوەخانەکان و باشترین جۆرەکانی قاوەی پێشکەشی بە کڕیارانی دەکرد.

سەرچاوە/ کتێبی (النجاح الحقیقی - کین شیلتون).

بە هێمنی

# ڕەمەزان
# مانگی بەخشندەیی و میهرەبانی!

ڕەمەزان ئەو مانگە پیرۆزەی کە تێیدا دڵەکان ئارام دەگرێت و دەروونەکان ئاسوودە دەبن و مرۆڤەکان بە گشتی هەست بە هێمنی و سەکینە دەکەن. ڕەمەزان ئەو مانگە پیرۆزەی کە هەموو ساڵێك دەبێتە میوانی خۆشەویستانی و بۆ ئەوەی گەردی دڵەکان لابەرێت و دڵە سپییەکان سپیتر و چاوە پڕ میهرەکان بە فرمێسکی تەوبەو سۆزو ئەوینی خودایی گەشتر بکات!

بۆ ئەوەی جارێکی تر مرۆڤە خودا ویستەکان، یەکتاپەرستە ئازادەکان، بەڵێنی ئیخلاس و دڵسۆزی نوێ کەنەوەو رووی نورانییان بکەنە رووگەی خوداو دەستی نزاو پارانەوەیان بۆ لای ئەو بڵند بکەن.

ڕەمەزان هاتووە تا گوناهی ساڵێکی پڕ جەنجاڵی و بێ ئاگایی و خەریك بوون بە دونیامان بۆ بسڕێتەوەو وەکو منداڵێکی ساوا لە گوناهەکانمان پاك بکاتەوە.

ڕەمەزان هاتووە بۆ ئەوەی هەست بکەین کە کەسانێك هەن برسین، تینون، ماندوون، مەحرومن لە زۆرێك لە خۆشییەکانی ژیان! بۆ ئەوەی ئێمەش دڵنەواییان بکەین و دەستی یارمەتیان بۆ درێژبکەین.

بۆ ئەوەی ئەگەر بەدرێژایی ساڵ بیرمان چوون، ئەوا لەم مانگە پیرۆزەدا بێنەوە خەیاڵمان و هەست بە ئازارەکانیان بکەین و باری سەرشانیان سوك بکەین.

ڕەمەزان هاتووە وانەی تەندروستی و کارگێری و بەرنامەڕێژی و ئابوری و پەروەردەی ڕۆحیمان پێ بڵێتەوە!

فێرمان دەکات لەم مانگەدا پشوویەك بە لاشەمان بدەین و ڕەچاوی تەندروستیمان بکەین، چونکە (ژیری ساغ، لە لاشەی ساغدایە)، فێرمان دەکات وەکو کاتژمێرێکی تەوقیتکراو لە ناسکترین کاتی بەرەبەیان و سەحەردا بتوانین هەڵسین و لە کاتێکی دیاریکراودا پارشێو بکەین و بە فەرمانێکی خودایی دەست لە خواردن هەڵبگرین و فێری خود کارگێری ببین و بتوانین تا خۆرئاوا خۆمان لە ئاوی ساردو هەموو جۆرە خواردنێك بپارێزین.

ئەم مانگە پیرۆزە ئەوەندە متمانەو هێزمان پێ دەبەخشێت، کە بەسەر نەفس و شەیتاندا زاڵ دەبین و ناتوانێت وەکو پێش ڕەمەزان فریومان بدات و گاڵتەمان پێ بکات.

ڕەمەزان فێری بەرنامە ڕێژی و سود وەرگرتنمان دەکات لە کاتەکانمان و وا دەکات هەر چالاکییە و لەکاتی خۆیدا ئەنجامی بدەین و زۆرترین کار لە ماوەیەکی کەمدا ئەنجام بدەین، لە چوار چێوەی پرۆسەیەکدا کە مافی خوداو خۆمان و کەس و کارو دەوروبەری تێدا ڕەچاو کراوە!

ڕەمەزان فێری ئابوری و ڕێزی نیعمەتمان دەکات و لە ئیسراف و دەستبڵاوی دوورمان دەخاتەوەو پێمان دەڵێت لەهەر شوێنێك خواردن و خواردنەوە بە هەدەر دەبرا ئەوا لە لایەکی تری ئەم زەوییە کەسانێك هەن بە برسێتی سەردەنێنەوە!

ڕەمەزان قوتابخانەیەکی بەرزە پەروەردەمان دەکات لەسەر ئاکاری جوان و وانەی خۆشەویستی و ڕێزگرتن و میهرەبانی و بەزەیی و بەخشندەییمان فێر دەکات.

دە با ئێمەش بتوانین گەورەترین سوود لەم مانگە پیرۆزە وەربگرین.

با بیکەینە وێستگەیەك بۆ باڵا بونی ڕۆح و گەیاندنی پەیامی هاوکاری و یارمەتیدان و برایەتی و بەهێزکردنی خۆشەویستی و پەیوەندییەکانمان.

با لەم مانگەدا سەردانی نەخۆش و دەردەدارەکان بکەین و دڵنەواییان بکەین و یارمەتیان بدەین.

با لەم مانگەدا سەردانی هەژاران بکەین و دڵخۆشیان بکەین.

با لەم مانگەدا منداڵانی بێ باوکمان بیر نەچێت و نازیان هەڵگرین.

با لەم مانگەدا خزم و کەس و کارمان بەسەر کەینەوەو هەواڵیان بپرسین.

با لەم مانگەدا هەوڵدەین لە خووە خراپەکانی وەك زۆر خواردن و زۆر خەوتن و تەممەڵی خۆمان ڕزگار بکەین و خوو بە چالاکی و توندو تۆڵی و بەرنامەسازییەوە بگرین.

با لەم مانگەدا زمان و چاوو گوێچکەو دڵمان بپارێزین، تا پاداشتی ڕۆژووەکەمان وەربگرین!

با بزانین کە ڕۆژو تەنها قەدەغەکردنی خواردن و خواردنەوە نییە!

بۆ ئەوەی ئێواران چێژ لە خۆشی بەربانگ وەربگرین و لە ڕۆژی دوایشدا بە دیداری ئەو خودایە دڵخۆشبین کە لە پێناویدا بە ڕۆژوو بووین.

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازارو ئاواتدا

## با نەوەکانمان ئامادەکەین

دروستبوونی متمانەو عەزیمەتی بەرەنگاربوونەوەی کێشەکانی ژیانو ئاشنابوون بە دەوروبەرو توانای مامەڵەکردن لە گەڵیدا، کۆمەڵە هۆکارێکی زێدە گرنگن بۆ دروستبوونی نەوەیەك کە بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتو نیشتمان پشتیان پێ دەبەسترێت، زۆر پێویستە ئێمە هەر لە سەرەتاوە بۆ بنیاتنانی ئایندەی نەوەکانمان کە ئایندەی وڵاتیشی پێوەبەندە بەرنامەسازی بکەینو بە وردی کاری لەسەر بکەین.

ئەمرۆ کاتێك گلەیی زۆر لە نەوەکانمان دەکەین کە توانای بەرەنگاربوونەوەی لەسەر پێ وەستانیان لاوازە! هەقی خۆیەتی کە چاوێك بە هۆکارەکانیشماندا بخشێنین، وێڕای ئەوەی پرسیارێکی سادەش ئاراستەی خۆمان بکەین، لە زەمانێکدا کە زۆر جیاوازە لە زەمانی خۆمانو باوباپیرانمان، چیمان کردووە بۆ ئەوەی نەوەکانمان لە ئاستی پێویستدا بن؟

ئایا هەر لەسەرەتای منداڵیانەوە وەکو هاورێیەکی باش دەستمان گرتوونو بە دەوروبەر ئاشنامان کردوون؟

بە هێمنیو لەسەرخۆ وەڵامی پرسیارەکانمان داونەتەوەو مافی قسەکردنو پرسیارکردنمان پێداون؟

شتە باشەکانمان پێ ناساندوونو داوای نزیك بوونەوەمان لێکردوون؟ هاوکات شتە خراپەکانمان پێ ناساندوونو داوای دوورکەوتنەوەمان لێکردوون؟

ئاکارو رەوشتی جوانمان تێدا چاندونو رامان هێناون لەسەر هەڵسو کەوتی جوان؟ هونەرەکانی ژیان لە گوێگرتنو ئاخاوتنو نووسینو خوێندنەوەمان فێرکردوون؟

فێری رێزگرتنی کاتمان کردوون؟

فێری چارەسەرکردنی کێشەکانمان کردوون؟ رامان هێناون بۆ ئەوەی بتوانن لە کاتی روودانی هەر گرفتێکدا بە هێمنی بیربکەنەوەو بتوانن بگەنە دۆزینەوەی رێگە چارەیەك؟

چونکە ئەگەر هەر لە سەرەتای منداڵییەوە فێری پشت بە خۆبەستنیان نەکەین بۆ چارەسەری کێشە بچکۆلەکانیان، کاتێك گەورەش دەبن بەرامبەر کێشە گەورەکان دەستەوەستان دەبن!

هاوکات هەر قۆناغێك لە ژیانی نەوەکانمان رەهەندو پێداویستی هەنووکەیی خۆی هەیەو بێ خۆ ئامادە کردن ناتوانن تیایدا سەرکەوتووبن.

بۆ نموونە: کاتێك کوڕو کچێکی گەنج دەچنە پرۆسەی هاوسەرگیریو پێکهێنانی خێزانەوە بێ هیچ ئامادەباشیو پلانو بەرنامەو زانیارییەك سەبارەت بەو قۆناغە نوێیە، دەبینین پاش ماوەیەکی کەم پرۆسەکە توشی هەڵدێر دەبێتو زۆر جار بە هەڵوەشاندنەوە کۆتایی پێ دێت.

هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان زانیارییەکی وەهایان سەبارەت بەو ژیانە نوێیە نەبووە، درکیان بەوە نەکردووە کە ژیان دوای ئەو پرۆسەیە تەنها رۆمانسیەت نییەو کۆمەڵێك ئەرکو ماندووبوون دەست پێ دەکات کە پێویستی بە ماندووبوونو قوربانیدانو لێبوردنو تێگەیشتنو هاوکاری کردنە، وێڕای ئەوەی کە مەبەستی سەرەکی ئەو پرۆسەیە دروستکردنی هێلانەیەکی نوێیە بۆ بنیاتنانی خێزانێکی کامەرانو ئاسوودەو سەربەخۆیو پشت بە خۆبەستن لە ژیانێکی نوێدا بۆ بەردەوامبوونی مرۆڤایەتیو ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی.

کەواتە ئەرکی دایكوباوكو قوتابخانەو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە کە رۆڵی خۆیان ببینن لە پێگەیاندنو ئامادەکردنی نەوەکاندا قۆناغ بە قۆناغ.

# بۆ ئەوەی هەردەم ئاسوودە بژیت...

و: مافناس: شۆخان محمد کریم

ئەگەر دەتەوێت لەم سەردەمی جەنجاڵیو بێ کاتییەدا بەختەوەرو ئاسوودە بژیت، ئەوا پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەیتو بە پێی توانا هەوڵی جێبەجێ کردنیان بدەیت:

١- رازی بە بەو بەهرەو سەروەتو سامانو ماڵو منداڵو هاوسەرەی کە خودا پێی بەخشیوی، ئەوا بەختەوەر دەبیت، لە نەبوونیو کەمی رزقو رۆزی مەترسە، چونکە سەری بێ رزق لەژێر خاکایە.

٢- بزانە لەدوای هەموو ناخۆشییەك، خۆشی دێت، دڵنیاش بە هەژاریو ناساغیو خەمو پەژارە بەردەوام نابێتو لە دوای رۆژە ناخۆشەکان، رۆژە خۆشەکان هەڵدێن.

٣- رازی بە بە هەموو ئەو شتانەی کە دەبێت هەر ببێت، واز لە داهاتوش بێنە، هەتا کاتی دێت، خۆت سەرقاڵی سبەینێ مەکە، چونکە ئەگەر ئەمرۆت چاك بکەیت، ئەوا سبەینێت بۆ خۆی چاك دەبێت.

٤- دڵت لە ناحەزیو رقو کینە پاك بکەرەوە، چونکە رقو کینە لە پێش هەموو کەسدا زیان بە خۆت دەگەیەنێتو وەفای بۆ خۆشت نییە، خۆت رابهێنە لەسەر ئەوەی کە خەڵکیت خۆش بوێت.

٥- ئەرکو فرمانەکانت زۆر زۆر گرنگەو بەم کارەت خۆشتو دەورو بەریشت ئاسودە دەکەیت.

٦- ئەوەی ستەمت بەرامبەر دەکاتو توانات هەیە سزای بدەیت، لێی خۆش بە، سەردانی ئەو کەسانە بکە کە سەردانت ناکەن، ببەخشە، چونکە بەخشندەیی ئاسودەیی لەگەڵ خۆی دێنێت، چاکەکاربە ئەگەر چاکەکەت کەمیش بێت.

٧- سەردانی نەخۆشخانەو نەخۆشەکان بکە، بۆ ئەوەی بزانی کە نازو نیعمەتی لەشساغی چەند گەورەیە، بیر لەو کەسانە بکەرەوە کە لە رووی ژێرییەوە ناتەواون، بیر لەو کەسانە بکەرەوە کە ئازادییان لەدەست داوەو لە چوار دیواری بەندینخانەکان دا شەوو رۆژ بەسەر دەبەن.

٨- گومانی خراپ بەکەس مەبە، چونکە زۆربەی گومانەکان بنەمای راستو دروستیان نییە، هەرگیز دەرگای رەشبینیو نائومێدی لەسەر خۆتو خەڵکی مەکەرەوەو هەوڵدە بەدەم ژیانەوە پێ بکەنەو ئەگەر بەزەردەخەنەیەکیش بێت خۆشی ببەخشە بە بەرامبەر.

٩- کاتێك هەست بەدڵ رەقی دەکەیت یارمەتی هەژارێك بدە، خواردن بدە بە برسییەك، نارەحەتییەك لە رێگەی لێقەوماوێك لابدە، ئەگەر هەر نەت دەتوانی باشترین دەرمان بۆ ئەوەی دڵت نەرم بێت، دەست بەسەری بێ باوکێکدا بێنەو کەمێك بیلاوێنەوە.

١٠-لە گەورەترینی دەرگاکانی بەختەوەریو ئاسودەیی، پارانەوەی دایكو باوکە، جا بۆ ئەوەی پارانەوەی دایكوباوکت بەدەست بهێنیت، چاکەیان لەگەڵدا بکە، هەتا نزاو پارانەوەکانیان ببێت بە قەڵغانێك بۆت.

١١- دوور کەوەرەوە لە چروکیو بەخیلی، چونکە ئەو کەسانەی چروكو رەزیلن هەردەم دڵ تەنگو نارەحەتن، بەخشندەبە با بەختەوەرو ئاسودە بێت.

١٢- ئاگات لە تاوانو خراپە بێت، چونکە تاوانو سەرپێچی سەرچاوەی خەمەکانە، هۆکاری بەڵاکانە، دەرگای کارەساتو نارەحەتیەکانە.

١٣- توورە مەبە، توورە بوون ئاکارە جوانەکانت ناشیرین دەکات، سۆزو خۆشەویستیت لەگەڵ خەڵکیدا لەناو دەباتو دۆستو هاوەڵانت لێ دەتۆرێنێ.

١٤- کاری ئەمرۆ مەخەرە سبەینێ، بترسە لەوەی کە بڵێی: لەمەودوا کارەکانم ئەنجام دەدەم، ئەمە سەرەتایەکە بۆ دۆڕانو شکست.

١٥-لەکۆڕو کۆمەڵدا، هەردەم خاوەن رەوشتی بەرزو جوان بە، لە وتەی چاكو بەسووددا نەبێت هەردەم بێ دەنگی هەڵبژێرە، چونکە ئەگەر قسەکردن زیو بێت ئەوا بێ دەنگی زێرە، قسە بە خەڵکی مەبڕەو زۆر بە جوانی گوێیان لێ بگرە.

١٦- زانستو خوێندنەوەی بە سود، دڵ فراوان دەکات، هەروەها ژیری زیاد دەکاتو خەمو نائومێدی لە دەروون وەدەردەنێت.

١٧- کاتێك تووشی نارەحەتیو بەڵایەك دەبیت، ئەوا خراپتر بێنە پێش چاوت، ئەگەر ناخۆشیو تاڵی نەچێژی هەرگیز تامی خۆشیو شیرینی ناکەیت.

١٨- راستگۆیی دڵنیاییە، درۆکردن دڵە راوکێو گومانە، شەرمو حەیا پاراستنە، رەوانبێژی جوانییە، بێ دەنگی هونەرو لێ زانینە.

١٩- تۆ لە هەموو کەس دەوڵەمەندتری، ئەگەر بڕواناکەیت، ئایا تەنیا چاوێکت بە هەموو سەروەتو سامانی دونیا دەفرۆشیت؟! ئایا لە بەرامبەر تەنها قاچێکتدا رازی دەبیت باشترینو جوانترینو تازەترین ئۆتۆمبێلت پێ بدرێت؟!

بێگومان رازی نابیت!!

بیر لەهەموو ئەو نازو نیعمەتانە بکەرەوە کە تیایدایت، لە کاری چاکەدا سەیری سەروو خۆت بکە، بەڵام لە سەروەتو سامانو ژیانی دونیادا سەیری خوار خۆت بکە.

هیوادارم ئەم خاڵانە ببێتە هۆی بەختەوەریو ئاسوودەییو ژیانێکی کامەرانت پێ ببەخشێت.

سوود لە کتێبی (التحرر) ی د.عائض القرنی وەرگیراوە.

# ئاسۆی وێنەیەك



سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسكو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێك لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دووا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) رۆژ دووای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.

# راهێنانی مێشك



به وردی لەم وێنەیە
ورد بەرەوەو
هێزی مێشكو بیرکردنەوەت
بخەرەکار،
بزانە چی دەبینیت؟
تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟

هێمن مەحوی

# ڕێزی دایك و باوك

ڕێزی دایكو باوك مەسەلەیەكی گرنگە لە مەسایلە كۆمەڵایەتییەكان كە پێویستە لەسەر هەر مرۆڤێك ڕێزی دایكوباوك بگرێتو خوێندنەوەیەكی میهرەبانانەی بۆ بكات، جیاواز لە ڕووداوەكانی دەوروبەری، دیارە هونەری ڕێزگرتنیش پێویستە لەسەر هەر تاكێك لە خۆیدا بەرجەستەی بكات ئەگەرنا ئەو تاكە لە ژیاندا توشی بێزاریو ڕەشبینی دەبێت، سەبارەت بە چۆنییەتی ڕێزگرتن لە دایكو باوك گۆڤاری بڕیار چەند كەسێك دێنێتە گوفتار:

**بەهادین مەجید توێژەری كۆمەڵایەتی:** لە بارەی ڕێزی دایكوباوكەوە دەڵێت: ڕێزگرتنو خۆشەویستی دایكو باوك ئەركی سەرشانی هەموو كەسێكە بە شێوازێك بتوانن مافیان بدەنو ببێتە جێگای دڵخۆشیان، چونكە سەركەوتن لە ژیانداو بەدەست هێنانی دوا ڕۆژێكی پرشنگدار پەیوەستە بەچەند هۆیەكەوە، یەكێك لەو هۆكارە گرنگانە (ڕێزگرتنو خۆشەویستی دایكو باوك)ە، هەروەها ئاماژەشی بۆ ئەوە كرد كە دەبێتە ئاسودەیی ڕۆحو دڵو دەرونو ئارامی بەردەوام، لە ژیاندا كارەكانت بۆ ئاسان دەبێتو دەبێتە هۆی ئەوەی خوای جیهانیان تۆی خۆشبوێتو لێت ڕازی بێت، باسی ئەوەیشی كرد كە دایكو باوك هەڵگرو لە ئامێزگری خەمو خەفەتو نارەحەتییەكانی (كوڕانو كچانن)و سەرچاوەی ژیانێكی ئاسودەو خەندەو خۆشی سەرلێوانو پاكترین دیاری خودان بۆ ڕۆڵەكانو نموونەی دڵپاكیو خۆشەویستیو قوربانیدانو خۆبەختكاری ڕێگای ژیانو قوتابخانەیەكن لە ئارامی دڵو دەروون، وەك شاعیر دەڵێت:

چەند گەڕام بۆ سوكنایی دڵی كۆرپەم - گەشتو سەفاو سۆزو لایە

هیچی هێدیو ئارام نەبوون - بەقەد نیشتیمانی كۆشی دایە.

بۆیە پێویستە لەسەر تاكەكان بە چاوی پڕ سۆزو خۆشەویستییەوە بڕواننە دایكو باوكیانو باڵی میهرەبانیان بۆ ڕاخەنو بەدوریان بگرن لە نارەحەتییەكانی دونیاو چەپكە گوڵی عەشقو خۆشەویستیان پێشكەش بكەن، لە هەمان كاتدا پێویستە دایكو باوك هەستو نەستی ڕۆڵەكانیان لە بەرچاوبێتو خۆشیان بوێن، وەك چۆن داوای ئەرك لە منداڵەكانیان دەكەن بە هەمان شێوە پێویستە مافەكانیان بۆ دابین بكەن، لە هەموو لایەنەكانی (دەرونیو كۆمەڵایەتیو ئاینیو ..هتد)، جیاوازیش دروست نەكەن لە نێوان منداڵەكانیاندا، چونكە كاریگەری خراپی دەبێت بۆسەر دەرونیان، ئاگایان لە هاوڕێكانیان بێتو هاوڕێی باشیان بۆ پەیدا بكەن، بۆیە دەبێت پەیوەندییەكی ڕاستو ئاشكراو ڕاشكاوانە هەبێت لە نێوان دایكو باوكو منداڵەكانیان، چونكە دەبێت هۆی لە یەك نزیكبوونەوە لە یەك تێگەیشتنی زیاتر.

دەبێت چەندان كەس لەم دونیایە ڕووبەڕووی لەم جۆرە خۆشەویستەی دایكو باوك ببنەوە كە ئەم گەنجە توشی بووە،

**گەنجێكی تەمەن ١٧ ساڵ بە ناوی (محمد)**

لە بارەی خۆشەویستی دایكو باوكەوە وتی: من مانای خۆشەویستی دایكو باوك نازانم چۆنەو ناشزانم چۆن ڕێزیان بگرم؟ چونكە من هەر لە منداڵییەوە لە لای دایكو باوكم نەماومو ڕوومكردووەتە لای باوانم لە كاتێكدا پێدەچێت براو خوشكەكانم بتوانن تەعریفێكی جوانی خۆشەویستی دایكو باوك بكەن، بەڵام من نازانم چی بڵێم لەم باسەدا كە تاكو ئێستا لەگەڵ دایكو باوكمدا بە تەواوی نەژیاوم.

**مامۆستا حسن شەمێرانی:** كە مامۆستایەكی ئاینییە لە بارەی ڕێزی دایكو باوكەوە دەڵێت: وشەی دایكو باوك ئەو دوو وشە پیرۆزو ناسكەیە كاتێ هەر مرۆڤێك دەیان بیستێ پێویستە بیانخاتە دەریایەكی قوڵ لە بیركردنەوە لە بارەی ئەم دوو مەخلوقەوە

لـه پلـەو پایەیان لـە ڕێـزو حورمەتیان لە ئەرك‌و ماندوو بونیان، باسـی ئەوەشـی کرد کـە دایك‌و بـاوك ئـەو دوو بەڕێـزەن کە لە سـەرەتای ژیانی ئێمەداو لە پێناو پاراسـتن‌و خزمەت‌و پەروەردەمان زەحمەتی زۆر زۆریان کێشـاوەو چەندەها شـەو خەویان لە خۆیان تۆراندووە لە پێنـاو خەواندنی ئێمەو چەند ئێـش‌و ئازارییان بـە خۆیان گەیانـدووە لە پێناو سـارێژکردنی ئێش‌و ئازاری من‌و تۆداو چەندەها کاتی پیرۆزو سـامانی خۆشەویستی خۆیـان سـەرفکردووە بۆ پاراسـتنی لاشـەو حەوانـەوەی دەروون‌و پۆشـتەکردنی بالأت‌و لابردنی برسێتی‌و تینوێتی ئێمە، ئەو مامۆستا ئاینییە باسی ئەوەیشـی کرد کە دایك‌و باوك ڕۆژ بـە ڕۆژو مانـگ بە مانگ سـەیری بالأی ڕۆڵەکانیان دەکەن تاکو بزانن کەی کورەکەیان یـان کچەکەیان گەورە دەبێت‌و چاوییان ڕوون ببێتـەوە بە بالأی بەرزیان، تاکو ئەوکاتەی کە هەست بە بوونی خۆیان بکەن‌و بتوانن خزمەت بکـەن، هێمای کرد بەوە کە یەکەم کەسـێ کە پێویستە لەسەر ئەم زەمینە خزمەتیان بکەین (دایك‌و بـاوك)ە، بۆیە قورئانـی پیرۆز دوای مافی پەروەردگار بەسـەرمانەوە باسـی مافی دایك‌و باوکی کـردووەو پێغەمبەریش درودی خوای لەسـەر بێت دەفەرموێت (بەهەشت لە ژێر پێی دایکانداى)ە، شـاعیران‌و ڕۆشنبیران‌و نوسەران لە بارەی گەورەیی‌و پلەوپایەو مافی دایـك‌و باوك شـتی زۆریـان نوسـیووە بۆیە دەبێـت ڕۆڵەکان خاوەن ویژدان‌و بە وەفا بن‌و خزمەتێکی بێ سـنور ئەنجام بدەن بەرامبەر دایك‌و باوکیان.

**سـەرکەوت ڕەسـول:** خوێنـدکاری زانکۆ ئامـاژەی بـەوەدا کـە قسـەکردن لەسـەر پەیوەندییـە خێزانییـەکان لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا ئاڵـۆزە، چونکـە تاکـو ئێسـتا ئێمە خاوەنـی پەروەردەیەکـی دروسـت نـین، بۆ ئـەوەی پەیوەندییەکی پتەویـش هەبێت لە ڕێزی دایك‌وبـاوك بەڕای من لـە چاککردنی پەروەردەی خوێندنەوە سـەرچاوە دەگرێت‌و دەبێـت گەورەکانی نـاو خێزان سەرمەشـق بن بۆ ئـەوەی بتوانن لـە نـاو منداڵەکانیان خۆشەویستی دروسـت بکەن بەرامبەر دایك‌و باوکیان، چونکە منداڵ پەڕەیەکی سپییە، باسی ئەوەشـی کرد کە بوونی هاوڕێیەتی لە نێوان دایك‌و منداڵ دەبێتە هۆی ئەوە کە قەد منداڵ بێ ڕێزی بەرامبەر دایـك‌و باوك نەنوێنێت‌و کاتێـك منداڵ هەڵەیـەك دەکات دایك‌و باوك وەڵامیان هەبێت بۆ چارەسـەرکردنی ئەوەك وەکو منداڵەکە بکەونە ناو هەڵەوە.

# هەندێ جار بیسەر وەك بینەر وایە...!!

و: بەهەشت محمد



لەسییەکانی سەدەی ڕابردوودا لە (میرسیلیا) لـەو کاتـەی جەندرمە مافیاکان لە شـارەکەدا دەستیان بەسـەر دەسـەڵاتی پۆلیس‌و دادگادا گرتبوو، بـە ئارەزووی خۆیان یاریان بە یاسـا دەکرد، سەرۆکێکی پلە بەرزی ئەو جەندرمانە هەڵسا بەکوشتنی یەکێك لە نەیارەکانی‌و پاشان دەستگیرکراو ڕەوانەی دادگا کرا.

ڕۆژی دادگایی کـردن: دادوەر پێش ڕۆژی دادگایـی کردنەکە کۆمەڵێـك بەرتیلی زۆری وەرگرتبوو تا لە ڕۆژی دادگایی کردندا سەرۆکی جەندرمەکان بەبێ تاوان لە قەڵەم بدات.

دادوەر بانگـی یەکێـك لە شـاهیدەکانی کردوو لێی پرسی: پێمان بڵێ چی ڕوویداوە؟

شـاهیدەکە زۆر بەئارامـی‌و دڵنیاییـەوە وتـی: من لە کۆگایەکـی بازرگانیدا کاردەکەم، کاتژمێـر دووی شـەو بـوو من لـە کۆگاکەدا بووم، بەڕێز (فـیران) کە خاوەنی کۆگاکە بوو لـەدەرەوەی کۆگاکە بوو، دواتر گوێم لەدەنگی فیشـەك بـوو بەراکـردن چووم بـەرەو لای دەنگەکە بینیم بەڕێز فیران لەسەر زەوییەکە کەوتووەو خوێن لە نێو چاوە ئەبڵەق بووەکانی دێتە دەرەوە، هەروەهـا بەڕێز (دیبوا)م بینی لەپێش کوژراوەکە ڕاوەسـتابوو، دەمانچەکەی بەدەسـتەوە بوو کە دوکەڵ لـە لوولەکەیەوە بـەرز دەبووەوە، جگە لە ئەو کەسـێکی تر لە شوێن ڕووداوەکەدا نەبوو.

دادوەر زۆر بەتوڕەییـەوە وتـی: ئایا خۆت ئەوت بینی فیشەك بە خاوەنی کۆگاکەوە بنێت؟

شاهیدەکە لە وەڵامدا زۆر بەسادەیی وتی: نەخێر بەڕێز، بەڵام ڕووالەتی وای دەردەخست کە ئـەو ئەوکارەی کردبێـت، چونکە هەر کە منی بینی دەمانچەکەی خسـتە گیرفانی‌و زۆر بـە توڕەییەوە چـاوی لە چاوم بڕی‌و پاشـان شوێنەکەی بەجێهێشت.

ئەو وای دەزانی کە من توانای ئاشکراکردنی ئەو کارەم نییە.

دادوەر ئەمجارەیان زۆر بەتوڕەییەوە هاواری کرد تۆ بینیت فیشەك بە فیرانەوە بنێت یان نا؟

شـاهیدەکە بەسـەر سـورمانەوە وەڵامی دایـەوە: بەڵکو گوێـم لە دەنگی فیشـەکەکە بوو.... دادوەر قسـەکەی پێ بڕی ئەمە نابێتە بەڵگەیەکـی تەواو بـۆ سـەلماندنی تاوانەکە، چەکوشـە دارینەکـەی دا بەسـەر مێزەکەی بەردەمیـداو ناوچەوانـی گرژکـردوو وتـی: شاهیدەکە بکەنە دەرەوە.

شـاهیدەکە لە توڕەییدا دەم‌و چاوی سوور هەڵگەڕا بوو، لە جێگەی شاهیدی دان هەستاو پشتی لە دادوەر کردو کەمێك دوورکەوتەوەو بەدەنگێکی بەرز وتی: دادوەرێکی نەفام‌و گێل لە بیرکردنەوەداو ناشیرین لە ڕوخسارو جل‌و بەرگدا.

دادوەر لەگەڵ توڕەبوونێکی زۆردا هاواری کرد چـۆن توانیـت گاڵتەجاری بەدەسـتەی دادوەری بکـەی ئـەی پیاو لەبـەر ئەو کارەت دادگا بڕیاری بەسـەرتدا دا بە......، شاهیدەکە ئـاوڕی دایـەوە بـەلای دادوەرداو قسـەکەی دادوەری بـڕی‌و وتی: ئایا خۆت منت بینی کە جنێوت پێ بدەم؟ دادوەر دەنگی توڕەیی بەرز کـردەوەو بەڵکو گوێم لێ بـوو، هەموو ئامادە بووەکانیش گوێیان لێت بوو.

شـاهیدەکە بـە زەردەخەنەیەکـەوەو ئەوپـەڕی زیرەکییـەوە وتـی: بـەڵام ئەمە بەڵگەیەکی سەلمێنەرو تەواو نییە بۆ قسەکەی بەڕێزتان.

دادوەر دەم‌و چاوی گرژ بوو، هۆڵەکەش پڕ لە پێکەنین‌و ژاوە ژاو بوو، هەموو ئامادەبووان جیاوازیەکانیـان بۆ دەرکـەوت، دادوەر خۆی بینییـەوە لـە بارودۆخێکدا کە هەڕەشـە لە کەسـایەتی‌و داهاتـووی دەکات، جگـە لە خۆ بەدەستەوەدان بۆ ڕای گشتی‌و ئەوەی کە بڕیار بدات بە لەسـێدارەدانی سـەرۆکی جەردەکان هیچ ڕێگەیەکی تری لەبەردەستدا نەبوو.

ئەمە یەکەم بڕیاری لە سێدارەدان بوو کە دەرچوو بەسـەر یەکێك لەسـەرۆکی جەردەو مافیاکان لە (میرسیلیا).

سەرچاوە: العلاقات/ ژمارە: ٣٠/ حوزەیرانی٢٠٠٩

# خێزانی بەختەوەر

## ڕێز لە هەست و سۆزی خێزانەکەت بگرە!

پەری شێخ کەریم

ئەگەر ئاواتە خوازی پیاوێکی سەرکەوتوو بیت، خەون بەو خێزانانەوە دەبینیت کە ئاسوودەن لە ژیانیانداو هەمیشە خێزانەکەت سەرزەنشتت دەکات بەوەی کە بێ هەستو سۆزیت بەرامبەری و زۆر تورەیە لێت، سەرەتا هەولبدە چارەسەری خودی خۆت بکەو گۆرانکاری لە رەفتارو کردارتدا دروست بکە!

بزانە ئەو خێزانانە چی گەیاندونیانەتە سەرکەوتنی ژیان، تۆش بە هەمان شێوە مامەلە بکەو دەروونی خۆتو خێزانەکەت ئاسوودەبکە، بێگومان تۆش کەسێکی وەکو ئەوان، توانای وتنی وتەی جوانو ئەنجامدانی کرداری باشت هەیە، ئەو کاتە دەتوانیت لە چوارچێوەی مالەکەتدا خێزانێك پێکبهێنیت دوور لە هەموو ناکۆکییەك، چونکە بەراستی ئەگەر لە سەرەتاوە توانای چاککردنی ناکۆکیەکانت هەبێت تەنانەت ئەگەر کێشەیەکی گەورەش بێت، بە ئاسانی چارەسەر دەکرێت، بەلام بە پێچەوانەوە هەمیشە زیزبوونو دوور کەوتنەوە لەیەکتری و شەرو ناکۆکی بەردەوام دەبێتە پیشەی هەمیشەیی و سەرەنجام تووشی خەمۆکی دەبن، تۆ خێزانەکەت تاوانبار دەکەیتو ئەویش تۆ تاوانباردەکات، ئەو کاتە هەموو دونیا ناتوانێت چارەسەرتان بکات، هەرکەس لە پێناوی خۆیدا بۆ خۆی دەژی هەردوو لا بێ ڕێزو بێ بەزەییانە مامەلەلەگەل یەکتریدا دەکەن ئەمەش ئەنجامی زۆر خراپی دەبێت. ئاواتە خوازین هیچ کام لەم ئەنجامانە روونەداتو هەموو خێزانەکان زۆر سەرفرازو ئاسوودە بژین لەژیانیاندا.

لەم ژمارەیەدا زۆر بە پێویستم زانی کە باس لەرۆلی پیاوان بکەین لە بنیاتنانی خێزانی بەختەوەردا، راستە هاوسەری بەرێز تۆ کەسێکی پێگەیشتوویتو تەمەنت زۆر گونجاوە کە بەرپرسیاریەتی خێزانێك بخرێتە ئەستۆت، پێشتریش پەیمانت داوە بە خودا، پاشان بە کەس کاری خۆتو خێزانەکەت کە پارێزگاری لە ژیانی هاوسەرێتیت بکەیت، بەلام پاش ماوەیەك ئەم پەیمانە لەیاد دەکەیت، پەیوەندیت لەگەل هەستوسۆزی خۆتدا نامێنێت، من نالێم بێ هەستو سۆزی، بەلام نازانیت چۆن بەکاری بهێنیت، رەنگە هەندێجار کەسێکت یاخود هاورێیەکت بۆ تەنها جارێك چاکەی لەگەلدا کردبێت، بەلام هەموو جارێك سوپاسی دەکەیت، خێزانەکەت بەردەوام بە سوورانەوەی کاتژمێر هەتا کۆتای تەمەنت چاکەت لەگەلدا دەکات بە هەلەیەك هەموو چاکەکان لە یاد دەکەیت؟ با هەمیشە پەیوەندیت بە هەستو سۆزتەوە هەبێت کاتێك دەگەرێیتەوە کەموکورییەك دەبینیت لە جیاتی راستەوخۆ تانەو قسەی رەقی لە روو بدەیت لێبووردە بە، وتەکانت بگۆرە بە وتەی جوان.

لێرە دا باس لە چیرۆکی ئەو پیاوانە دەکەین لە دوای گەرانەوەیان بۆ مالەوە بە چ شێوەك مامەلە دەکەن لەگەل خێزانەکەیاندا:

((رۆبرت مارك ألتر ) لە کتێبی (زوج صالح، زواج ناجح)دا دەلێت: ئافرەتێك بەناوی (مارجۆ)ە وە دەلێت: کاتێك پیاوەکەم دەگەرێتەوە زۆر بەخێرایی سلاو دەکات لە کاتێکدا بەوبەپەری خۆشییەوە لە بەر دەرگاکە رادەوەستم بۆ پێشوازیکردنی و چاوەروانی دەکەمو مندالەکانم بە پیرییەوە دەچن، بەلام زۆر بە رووگرژی و بێزارییەوە وەلامیان دەداتەوە، پاشان دێتە سەرخوانەکە نانەکەی دەخوات بێ ئەوەی بتوانێت وتەی سوپاس بە کاربهێنێت، لە کاتێکدا من لە پێناوی رەزامەندی ئەودا چەند کاتژمێرێك خۆم ماندوو کردووە بە ئامادەکردنی ئەو خواردنە پاش ئەوەی کە نانەکەی دەخوات دەروات بۆ سەیرکردنی تەلەفزیۆن یا خوێندنەوەی کتێبێك هەتا ئەو کاتەی تەسلیم بە خەوتن دەبێت، پاش ئەوە دەلێت: من زۆر ماندووم، دەچم دەنووم، تکایە بێدەنگ بن، بەیانی کاری زۆرم هەیە.

بەو شێوەیە رۆژانەمان بەرێوە دەچێت!! من دەزانم پیاوەکەم لە پێناوی ئێمەدا ماندوو دەبێت، بەلام حەز ناکەم هەموو ژیانی تەرخان بکات بۆ ئیشوکارو دنیا، ئەی مافی منو مندالەکان؟ رۆژ لە دوای رۆژو سال لە دوای سال، تەمەنمان بەرەو زیادبووون دەچێت ئەگەر ئەمرۆ بێ هەستو سۆز بین بەرامبەر یەکتری کەی پرسیار لە ژینی یەکتری دەکەین؟

روبرت دەلێت: بۆ ماوەی سی سالە لە بواری رێنمایی خێزانیدا کار دەکەم، زۆربەی ئەو پیاوانەی کە پەیوەندیم پێوەدەکەن، یاخود سەردانم دەکەنو دێن بۆ نووسینگەکەم دەبینم خۆیان بە کەسێکی پێشکەتوو سەرکەوتوو دەزانن، یا بە پیاوێکی نموونەیی خۆیان لە قەلەم دەدەن، بەلام بەداخەوە بیروبۆچوونی هەلەیان هەیە لە بواری خێزانیداو لە چۆنێتی پەیوەندی کردن بە خێزانەکانیانەوە، بۆ نموونە: بایەخ نادەن بە هەستوسۆزی خێزانەکانیان، یا گوێ نادەن بە راو بۆچوونو دلخۆش کردنیان، بە کارێك یا خود وتەیەك.

لێرەدا بە چە ند ئامۆژگارییەك کۆتایی بە باسەکەمان دەهێنین:

★ ئەگەر رەفتارێك یاخود وتەیەکی هەلەت بەرامبەری نواندووە، هەستە بە کارێکی باش لە پێناویدا تا ئەو وتەو کردارانەی رابردوی لە یاد بچێت.

★ ئەگەر تا ئێستا پەیوەندییەکی بە هێزت نەبووە لەگەل خێزانەکەتداو بیرت لە چارەسەر نەکردۆتەوە، هەروەك وتراوە ئەوەی رۆی تازە رۆی، بەلام لە مەودوا بیر لە چارەسەرکردنی خۆت بکەرەوە هەتا بتوانیت هەلسوکەوتی خێزانەکەت بگۆریتو هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێو ژیانت بگۆرە.

★ تەنها بیر لە ئارەزووی خۆت مەکەرەوە، بەلکو بایەخدان بە ئارەزووی خێزانەکەت زۆر پێویستە.

و: م/ بێگەرد هەورامی

# تەنها ژنێك بەس نییە..!

به گریانەوه هاتەژوورەوه، بەدەنگێکی بەرزو شلەژاوو بیری شێواو هاواری دەکرد...

پێم وت: لەسەر خۆبە.. چی رویداوە؟ بەهێمنی قسه بکه تالێت تێ بگەم، بەڵام سودی نەبوو، هاواری دەکردو ئەیوت: ئەی ناپاك دوای ئەو هەموو خۆشەویستییە!

دوای ئەو هەموو پیاهەڵدانو تەمەنەی پێکەوه بوین؟ دوای ئەوەی خونچەی لاوێتیم لەخزمەتی ئەوو منداڵەکانیدا لەدەستدا، دوای... دوای...

پێم وت: باشه چی روویداوە؟

وتی: دەیەوێت ژن بهێنێت!

پاش چەند کاتژمێرێك هەوڵدان بۆ هێمن کردنەوەی پێم وت: له جیاتی ئەو هاوارو لۆمەو گازەندە کردنه، بۆچی ناپرسی له خۆت، چ هۆکارێك هەیه وایکردووه بەدوای ژنێکی تردا بگەرێ؟ هەرچەندە باشدەزانم که زۆری خۆش دەوێیتو ئاستەمە دەست بەردارت ببێت، بێگومان ئەو پێویستی به ژنێك هەیه تا لەرووی سۆزو دەرونەوه جێگیربێت.

وتی: مانای ئەوه وایه رازیبم بەو واقیعەی که هەیه؟

وتم: نەخێر، بەڵام ئەگەر دەتەوێت هەمیشه هاوسەری بیت، ئەویش تەنها موڵکی تۆ بێت، یان ئەگەر بەراستی ئەوت دەوێتو ژیانی خۆتت لا مەبەستە، ئەوا پێویسته رۆڵی چوار ژنی بۆ ببینی!

وتی: ئەوه چۆن دەکرێت؟

وتم: پیاو چوار جۆر ئافرەتی خۆش دەوێت:

یەکەم: دایك! ئەو دایکێکی خۆش دەوێت له سۆزو بەخشینه بێ سنورەکانی بێبەشی نەکات، بەخشینێکی بێدەنگ که هیچ منەتو ئازارێکی لەگەڵدا نەبێت، دایکێکی دەوێت که سنگی فراوان بێتو لێبوردەو میهرەبان بێت ئەگەر هەڵەی کرد.

ئەگەر توشی شتێك بوو پێوستی بەهاندانو هاوکاریو گرنگی پێدانه، دایکێکی دەوێت له کاتی ناخۆشیدا دەستەکانی بگرێتو له خۆشییەکانیدا دڵخۆش بێت، له شەونخونیدا له لای سەرییەوه دابنیشێت، لەکاتی نەخۆشیو ئیشوکاریدا جێی نەهێڵێت، دڵخۆش بێت له کاتی ئامادەبونیداو نیگەرانو نا ئارام بێت کاتێك نادیار دەبێت، ئەو دایکێکی دەوێت که دوای پرۆسەی هاوسەرگیری لەدەستی چووە، هەر کات هەستیکرد پێویستی پێیەتی، دڵی بۆی لێدەدات!

دووەم: خۆشەویست! ئەو خۆشەویستێکی شەیدای دەوێت، که لێهاتووانه دڵی دەباتو دەیهەژێنی... ئافرەتێکی دەوێت که به سەلیقەو بۆنخۆشو خاوەنی سۆزێکی تایبەتو سیحری خۆی بێت، دەیەوێت لەنێوان دەستەکانیدا به عەشقو شەوقەوه بتوێتەوە!

سێیەم: هاورێ! ئەو هاورێیەکی دەوێت که رازی دڵی بۆ دەکاتەوە، راوێژی پێدەکات له کاروبارەکانیدا، هاورێیەکی دەوێت نهێنی بپارێزیو کەموکورییەکانی داپۆشێت، نەك ژنێك هەموو نهێنییەکانی بڵاوبکاتەوەو عەیبەکانی لەناو دراوسێو هاورێو کەسوکاریدا باس بکات، ئەو عەقڵی دەوێت، ژیریو راوێژەکانتی دەوێت، نەك زمانو زۆر وتن لەو شتانەی پەیوەندییان به تۆوە نییە.

کاتێك دەیەوێت قسه بکات به جوانیو تەرکیزەوه گوێی لێ بگرە، نەك زۆر قسه بکەیتو بەردەوام سکاڵای لەلا بکەی، بۆیە پەنادەباته بەر بێدەنگی لەماڵدا یان به جێهێشتنی ماڵو بەسەربردنی زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ هاورێکانی کەلێی تێدەگەنو گوێی لێدەگرن.

چوارەم: ئامادەکار!

دەیەوێت به دەستەکانی خۆت خواردنی بۆ ئامادە بکەی، هەرچەندە خزمەتکاریشت هەبێت، پێی خۆشه پێویستییەکانی بەدەستی خۆت بۆ رێکبخەیت، دەیەوێت جێدەستت له ماڵەکەتدا دیار بێت، به گرنگی دانت بەروخسارو شێوەو رووکەشی خۆتو منداڵەکانت خۆشحاڵ دەبێت...

بەو شێوەیە ئەگەر دەتەوێ ئەو تەنها موڵکی تۆ بێت؟ ئەوا ببه به چوار ژن بۆی لەیەك جەستەدا دەبیته خاوەنی دڵو عەقڵو گیانی....

وەك ئامۆژگارییەك بۆ خانمانی ئازیز دەڵێم: هەرکاتێك هەستت به کەمتەرخەمی یان گوێ پێ نەدان کرد لەلایەن هاوسەرەکەتەوە، ئەوا بەخۆتدا بچۆرەوە بزانه چ شتێك بۆتە هۆکار بۆ ساردبوونەوەی پەیوەندییەکانتان، پاش درککردنت بە هۆکارەکە هەسته به چاککردنو باشکردنەوەی پەیوەندییەکانتان، سەرەرای هەستکردن به دڵتەنگیو نارەحەتی خودی خۆتان دەبنه هۆی دروستکردنی دۆزەخێکی دنیایی له ماڵەکەدا، ئەگەر دەتەوێ له بەهەشتی دوارۆژ بێ بەش نەبیت، ئەوا بەهەشتێکی بچووك له دونیادا پێك بهێنە.

بەهیوای بەختەوەریو کامەرانی هەتا هەتایی بۆ هەموو خێزانێك...

سەرچاوە: مجلة النجاح اليمنية

# بۆ منداڵەکەت بخوێنەوە!

و/ محەمەد مێرگەیی

لەوانەیە هیچ یەکێك بەتەواوی وەڵامی ئەم پرسیارەی لا نەبێت (کێ یەکەم کەس بووە، شەوان بەر لە خەوتن، چیرۆکی بۆ منداڵەکانی خوێندبێتەوە؟)، دەشێ دایکێك بووبێت کاتێك نەیتوانیوە منداڵەکەی هێمن بکاتەوە، دەستی داوەتە کتێبێك و لە ڕێگەی خوێندنەوەی چیرۆکێکی خۆش و جوانەوە منداڵەکەی ئارام کردۆتەوە، بەڵام دەبێت مەسەلەی خوێندنەوەی باوکان و دایکان بۆ منداڵەکانیان لە سەدان ساڵەوە سەری هەڵدابێت و کاریگەری بەهێزی هەبووە لەسەر هەر یەکێك لە منداڵەکە و باوك و دایکەکەش.

پرۆسەی خوێندنەوە بۆ منداڵ بە ماوەیەکی زۆر بەر لە پەیدابوونی پزیشکانی دەروونیی منداڵان دەستی پێکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند ساڵێکە (خوێندنەوە بۆ منداڵ) یەکێکە لە یەکەمین ئەو ئامۆژگارییانەی ئەم پزیشکانە ئاراستەی باوکانی دەکەن، ئەوان واتە پزیشکانی دەروونیی منداڵان، ئامۆژگارییان ئەوەیە کە تاوەکو لە کاتێکی زووتردا باوکان و دایکان ئەم کارە دەست پێبکەن باشترە.

چەند ساڵێك لەمەوپێش دیراسەیەکی زانیاری کۆکردنەوە لەسەر ئەو کەسانەی (بەدەستکەوتەکانیان و خزمەتکردنی کۆمەڵگەکانیان) ناسراون ئەنجامدراوە، یەکێك لەو پرسیارانەی لەو دیراسەیەدا ئاراستەی کەسەکان کراوە بریتی بووە لەوەی: (مەزنترین ئەزموون گەلی منداڵیتی کاریگەر لەسەر ژیانتدا چی بووە؟) لە وەڵامی ئەم پرسیارەداو لەبارەی هەڵسوکەوتی باش و پاڵپشتی کاری باوکان بۆ منداڵەکانیان، وەڵام گەلێکی فرەو هەمەچەشن وەدەست هاتوون، وەلێ یەکێك لە وەڵامە زۆر بڵاوەکان بریتی بوو لەوەی: (دایك و باوکم شەوانە بۆیان دەخوێندمەوە)!

ئەو دەستکەوتانەی لە پەنای (خوێندنەوە بۆ منداڵ) بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەدەست دەهێنرێن زۆرن، لەمانە:

*خوێندنەوە بۆ منداڵ، پەیوەندییەکی بەهێزی سۆزداری و جەستەیی لەنێوان منداڵەکە و باوك و دایك دروست دەکات:

کاتێك دایك یان باوك لە کاتی خوێندنەوەیاندا بۆ منداڵەکەیان لەسەر جێگەی خەوتنی منداڵەکە دەبن، ئەم پەیوەندییە جەستەییەیان لەگەڵیدا هەستی ئارامیی و دڵنیایی پێدەبەخشێت. ئەو چیرۆکانەش کە دایك بۆ منداڵەکەی دەگێڕێتەوە وا لە منداڵەکە دەکەن پرسیارو باس و خواس لەبارەیانەوە بخاتەڕوو، ئەمەش دەبێتە مایەی دروستبوونی دایەلۆگێکی ئامانجدارو نزیکبوونەوە لە ڕووی سۆزدارییەوە.

*خوێندنەوە بۆ منداڵ، ڕێخۆشکەرە بۆ ئاگاداربوونی منداڵەکە لە چیرۆك گەلی گەورەو کاریگەرو خاوەن پەیامی ڕەوشتیی:

دیارە باوکان و دایکان جۆرە چیرۆکێك بۆ منداڵەکانیان هەڵدەبژێرن کە بەشێوەیەکی باش نووسرابن و پەیام گەلێك لە خۆبگرن کە پێداگری بکەن لەسەر تایبەتمەندی کەسێتی پۆزەتیڤانە. ئەمەش وا لە منداڵ دەکات، لە قۆناغەکانی داهاتووی ژیانیدا پێیانەوە کاریگەربێت. لە سەردەمی ئەمڕۆشدا

بڕێکی زۆری کتێبی منداڵان هەن کە باوکان دەتوانن هەڵیان بژێرن و بۆ منداڵەکانیان بیانخوێننەوە.

* خوێندنەوە بۆ منداڵ، خۆشەویستی خوێندنەوەی لەلا دەچەسپێنێت:

توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەو منداڵانەی هەر لە بچووکییەوە کتێبیان بۆ دەخوێنرێتەوە، کاتێك دەکەونە تەمەنەوە ئەگەرەکانی پێشەوەچوونیان لەپێناوی چێژوەرگرتن و مەعریفەدا زیاتردەبێت، هەروەها خوێندنەوە بۆ منداڵان وەکو دژە ژەهرێکی گەورە وایەو دەیانپارێزێت لە بابەتە خراپ و زیانبەخشەکانی میدیاو ڕاگەیاندنی سەردەمی ئەمڕۆ، ئەم جۆرە منداڵانە هەر ئەوە نییە تەنها لە خوێندنەوەدا باش بن و بەرەو پێشەوە بچن، بەڵکو خەیاڵ و ئەندێشەکانیان گەشەدەکات و دەبنە هاوڵاتی خاوەن هۆشیاری و مەعریفەی باشتر.

*خوێندنەوە بۆ منداڵ، لە قوتابخانەشدا بەرەو سەرکەوتنی دەبات:

یەکێك لە ئەنجوومەنە نەتەوەییەکانی پەیوەندار بە خوێندنەوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، دوای توێژینەوەیەکی چڕوپڕ لە بابەتەکەدا، گەیشتە ئەوەی کە (گرنگترین بەشداری کردنی باوکان لە پێناوی سەرکەوتنی منداڵەکانیان لە قوتابخانەدا بریتییە لە خوێندنەوە بە دەنگی بەرز بۆیان!)، کەواتە دەکرێت باوکان ڕۆڵێکی کاریگەرو ئەکتیڤیان هەبێت لە گرتنە ئەستۆی بەرپرسیاریەتی پەروەردەیی و فێرکاریی و لە بە دەستهێنانی پلەی بەرز لە تاقیکردنەوەکانی قوتابیاندا، ئەمەش کارێکە هەموو نەتەوەیەك پێویستی پێ هەیە.

* زۆر دەستکەوتی تر هەن کە لە ئەنجامی خوێندنەوە بۆ منداڵ بەدەست دەهێنرێن لەوانە:

فێربوون و خۆشگوزەراندن بەبێ تێچوونێکی زۆر، گفتوگۆی ئامانجدار، وانە گەلی ڕەوشتیی و گەشەپێدانی بەهرەو تواناکانی نووسین.

(لەوانەیە تۆ سەروەت و سامانێکی زۆرت هەبێت، چەندین سندوقی گەوهەرو گەنجینەی زێڕ، بەڵام هەر چۆنێك بێت تۆ لە من دەوڵەمەندتر نیت، من دایکێکم هەبوو بۆی دەخوێندمەوە، ستریکلاند جیلیان).

سەرچاوە/

کتێبی (کلمات ایجابیة نتائج فعالة –هال ایربان)

و: هێرۆ محەممەد نەڵماس

# با هەر ئەمڕۆ نمرەی دەرچوون و قەبوڵی لەخوا وەرگرین!

خودا لە تاقیکردنەوەکەیدا داوای هیچ بابەتێك لە ئێمە ناکات کە لە دەرەوەی کتێبەکەی (قورئان و وتەکانی پەیامبەردا) بێت.

تاقیکردنەوەی ئیلاهی تەنها پراکتیکی و کردارییە، خودا لە تاقیکردنەوەکانیدا پێویستی بە چاودێر نییە، ئەو هەر خۆی بە تەنها چاودێری هەمووانە.

لە تاقیکردنەوەی خواییدا قۆپی و فێڵ و غەش ناکرێت، ئەو لەو شتانەدا کە دەیانزانین تاقیمان دەکاتەوە، هەروەها ئەگەر سەرپێچییەکمان لە ڕووی نەزانین یاخود لەبیرچوونەوە ئەنجامدا، ئەوا نمرەمان لێ کەم ناکاتەوە.

خوای گەورە هەندێ شتی گرنگی ئەوەندە دووبارە کردۆتەوە، تاوەکو تەممەڵترین کەسیش فێریان بن و لەبەریان بکەن.

پەروەردگار لەتاقیکردنەوەکەیدا داوامان لێدەکات کە خۆمان بخوێنینەوەو نمرە بدەینە ویژدانمان.

لە تاقیکردنەوەی ئیلاهیدا ئەگەر نمرەیەکی خراپ وەرگرین و بەدەست بهێنین، ئەوا دووبارە هیواو ئومێدمان پێ دەبەخشێتەوە کە هێشتا کۆتایی ڕێگە نییە، هەوڵ بدە قەرەبووی بکەیتەوە.

ئەگەر نمرەیەکی باش وەرگریت و بە دەست بهێنیت، ئەوا لە ناو بەهەشتی ڕەزامەندی خۆیدا لە ڕۆژی دواییدا میوانداری و پێشوازیت لێ دەکات.

لە تاقیکردنەوەی خوادا ئەگەر بڕیار بدەیت خراپی و ناباشییەکانت قەرەبوو بکەیتەوە، ئەوا خەت وهێڵ دەهێنێت بەژێر هەموو کردەوە خراپەکانتدا تاوەکو ببنە کردەوەی باشە و لە لای چەپی هەر سفرێکدا ژمارەیەکی (٢)ت بۆ دادەنێت.

خوا هەموو ڕۆژێك ئامادەی تاقیکردنەوەیە، ئەوەندە بەسە کە تۆ دووبارە بڕیار بدەیت، ئەو ئامادەیە کە دووبارە ئەزموون و تاقیت بکاتەوە.

پەروەردگار خۆشحاڵ دەبێت و پێی خۆشە کاتێك ئەگەر لە تاقیکردنەوەکەتدا سەرکەوتوو نەبوویت و خراپ بوویت، لێی بپاڕێیتەوەو داوای لێ بکەیت و لە دەرگاکەی بدەیت.

پەروەردگار لە ساتەکانی تاقیکردنەوەشدا تەنهات ناکات و بەجێت ناهێڵێت و بە دەنگێکی بەرز بانگت دەکات و ڕێنومایت دەکات، ئەڵبەتە ئەگەر لۆکەت نەکردبێتە ناو گوێچکەکانتەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەنگی دەبیستی.

خوا خەڵکانی دیکەی پێش ئێمەشی وەك ئێستای ئێمە تاقیکردۆتەوە، خۆش ئەوەیە کە پەروەردگاری جیهانیان هەر خۆی پرسیاری تاقیکردنەوەی خەڵکانی دیکەی پێش ئێمەی لە کتێبەکەیدا -قورئان- باس کردووەو جەختی لەسەر کردوونەتەوە.

خوا سبەینێش هەم دیسان تاقیکردنەوە ئەنجام دەدات، بەڵام لەوە دەچێت سبەینێ ئێمە نەبین، کەواتە وەرن با بڕیار بدەین و هەر ئەمڕۆ نمرەی قەبوڵی لەخوا وەربگرین.

سەرچاوە/ گۆڤاری: موفقیت، ژمارە/ ١٥٧

# ببە بە خاوەنی دەستێکی سپی

سایە فارس

هەندێجار کە کەسێك دیارییەك یان شتێکی سادەمان پێ دەبەخشێت هەست بە خۆشی دەکەین و لە دڵەوە سوپاسی دەکەین، بەڵام ئەگەر ئەو شتەی کە دەبەخشرێت یەکێك بوو لە پێویستییەکانمان کە توانای چنگ کەوتنیمان نییەو ئاواتەخوازین بۆی، ئەوا زۆر ئاسوودەو شادمان دەبین، بە جۆرێك ناتوانین و نازانین بە چ ڕێگەیەك هەست و خۆشحاڵیمان دەربڕین، ئەم هەستە لە لای کەسی بەخشەر زیاترەو کەمتر نییە لە هەستی خۆشی وەرگرەکە، جیاوازی کردن لە نێوان بەخشین و وەرگرتن ئاسان نییە، لەبەرئەوەی لە جیهانی ڕۆحدا یەك مانا دەبەخشێت.

کەسی بەخشندە خاوەنی دەستی سپییەو لەهەمان کاتیشدا خاوەنی دڵێکی ئاسوودەو ویژدانێکی زیندو خۆشبەختی و کامەرانی باڵ بەسەر ڕۆح و جەستەیدا دەکێشێت، لە کاتێکدا وەرگرەکە ئەو هەستەی هەستێکی مادیانەیە کە لەئەنجامی دەستکەوتن یان جێبەجێ بوونی پێویستییەکی دا هاتۆتە دی..

یەکێك لەهۆکارەکانی بەختەوەری ئەوەیە بتوانیت پێداویستی نەدارێك یان بێ دەسەڵاتێك پڕ بکەیتەوە، لە پێناوی خزمەتکردندا مۆم ئاسا بسوتێیت و دەورووبەرت ڕووناك بکەیتەوە، ئەگەر ئارەزوومەندیت ببیتە خاوەنی دەستێکی سپی ئەوا هەوڵ بدە یارمەتیدەرو هاوکارو هاوڕێی کەسانی تر بیت، ئەگەر خاوەنی سەروەت و سامانێکی ئەوتۆ نیت تا پێیان ببەخشیت، ئەوا بە وشەی جوان و هیوابەخش بەسەریان بکەرەوە، ئەگەر ئەوەشت لە توانادا نەبوو بێ بەشیان مەکە لە زەردەخەنەیەك، کە زۆر ئاسانەو هەموو کەس لە توانایدا هەیە، کاریگەرییەکی زۆریش لەسەر دڵی بەرامبەر دروست دەکات.

جۆرج برناردشۆ دەڵێت: «کامەرانی ڕاستەقینە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هێزی ناوەکیت لە خزمەتی کەسانی تردا بتوێنیتەوە، نەك بگۆڕێت بۆ هێزێکی خۆپەرست کە سکاڵای ئەوە بکات جیهان خۆی تەرخان نەکردووە بۆ بەختەوەرکردنت».

زۆربەی کات کەسی بەخشندە سوودمەندترە بە بەراورد لەگەڵ وەرگرەکە، سەرەڕای خۆشبەختبوونی بەوەی بووەتە هۆی ئاسوودەکردنی بەرامبەر لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار بە بەخششێکی گەورەتر بەسەری دەکاتەوە، با لەم بەسەرهاتە ڕابمێنین و بیکەینە نموونەی باسەکەمان:

لەبەرنامەی (البیت بیتك)ی کەناڵی ئاسمانی میسری کە (محمود سعد) پێشکەشی دەکات، لەیەکێك لە زنجیرەکانی ئەم بەرنامەیەدا باسی لە منداڵێکی هەژاری نەخۆش دەکرد کە پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە لە دەرەوەی وڵات، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بە (١٥٠) هەزار یۆرۆیە! چونکە حاڵەتەکەی ترسناکەو دەبێت زۆر بەخێرایی و هەرچی زووترە فریای بکەون و لەو نەخۆشییە ڕزگاری بکەن، لە کاتی پێشکەشکردنی بەرنامەکەدا گەنجێك بەناوی (شەریف) پەیوەندی دەکات و بڕی (١٥) جونەیهی میسری دەبەخشێت بە خێزانی منداڵەکەو دەڵێت: دەزانم ئەو بڕە پارەی من زۆر کەمەو شایەنی ئەوەی نییە، بەڵام بۆ کەسێك کە پێویستی پێ بێت کەم نییە، ئەم لاوە دەڵێت لە کەمی کۆمەکەکەم داوای لێبوردن دەکەم، چونکە لە ڕاستیدا من نیوەی سەروەتەکەم بەخشیم! ئەوەی جێی تێڕامان بوو ئەوەبوو کە لە هەمان بەرنامەدا ڕوویدا، ئەویش هەر ئەو شەوە کەسێك پەیوەندی کردو پاش بەخشینی بڕێك پارەی باش بۆ نەخۆشەکە (١٠٠٠) جونەیهیشی کردە دیاری بۆ شەریفی تازە لاو، پاش ئەو بە هەمان شێوە کەسێکی تر پەیوەندی کردو بڕێك پارەی بەخشییە خێزانی منداڵە نەخۆشەکەو بڕی (٥٠٠) جونەیهی کردە دیاری بۆ بەخشەری (١٥) جونەیهەکە.

لەزنجیرەی دواتردا پێشکەشکاری بەرنامەکە میوانداری شەریفی کرد، لە میانەی ئەو دیمانەیەدا ڕوون بووەوە کە وێنەگری تەلەفزیۆنییە، بەڵام کاری نییە بیکات، بەهۆی ئەمەوە وەزیری ڕاگەیاندن بڕیاری دامەزراندنی دەدات بە وێنەگری هەمان بەرنامە لەو کەناڵەدا.

شەریف باس لەوە دەکات و دەڵێت: من شەرمم دەکرد کە بڵێم: ئەو (١٥) جونەیهە نیوەی هەموو ئەو سامانەیە کە خاوەنیم، بەڵام ناچار بووم هۆکارەکەی ڕوون بکەمەوە، لەبەر کەمی بڕی پارەکە، شەریف لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: لە کاتێکدا کە سەیری بەرنامەکەم دەکرد باسی لە منداڵێکی هەژار دەکرد کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی پێویستی بە پارەیە بۆ چارەسەرکردنی لەدەرەوەی وڵات، منیش دایکم کە بەهۆی خەمخواردنی مردنی دوو برامەوە تووشی نەخۆشی دڵ هاتووە، لێم پرسی دایە گیان چەند پارەمان هەیە، ئەویش وتی کەمتر لە (٣٠) جونەیهەو پارەی کارەباشمان نەداوە پێم وت: ڕات چییە ئەگەر نیوەی ببەخشینە خێزانی ئەو منداڵە هەژارە؟ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: کورم کێ هەیە هەست بە ئازاری نەخۆشێك بکات زیاتر لەو کەسەی کە خۆشی بەدەست ئازارەوە دەناڵێنێت؟ بیبەخشە کورم... بیبەخشە!

دوای بەخشینی (١٥) جونەیهی میسری لەلایەن شەریفەوە، لە جێی ئەوە دەبێتە خاوەنی (١٥٠٠) جونەیهو دەکرێتە وێنەگری هەمان بەرنامە کە چەند ساڵێك بوو خەونی پێوە دەبینی!!

کەواتە هەرگیز ڕاراو دوو دڵ مەبە، نائومێد مەبە لەوەی کە دەیبەخشیت، لەبەرئەوەی هەر هیچ نەبێت دەبیتە خاوەنی دەستێکی سپی کە ئەوەش دەبێتە ئاوپرژێنێك بۆ دڵ و دەروونت و ئاسودە دەبیت..!!

بۆ ئەوەی بەختەوەر بیت... بۆ ئەوەی ئاسوودەیی میوانی هەمیشەیی ڕۆحت بێت... بۆ ئەوەی دڵ ئارام و کامەران بیت... ببە بە خاوەنی دەستێکی سپی..

# وتراوە سەبارەت بە خێزان

ئالانی

١- ئافرەت لە مۆخی پیاو دروست نەکراوە تا پیاو بکاتە کۆیلەی خۆی، هەروەها لە پێیەکانیشی دروست نەکراوە تا ئافرەتەکە بکاتە کۆیلەی خۆی، بەڵکو لە پەراسوی دروستکراوە تا هاوبەشی بکات لە ژیانیدا، پەراسوش لە ژێر باڵدایە، بۆئەوەی بیپارێزێو بەرگری لێ بکات، جگە لەوەش پەراسوو دراوسێی دڵە تا خۆشی بوێت!

٢- پیاوی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە زیاتر پەیدا دەکات لەوەی کە خێزانەکەی خەرجی دەکات، ئافرەتی سەرکەوتوش ئەو کەسەیە کە ئەو جۆرە پیاوەی دەست دەکەوێت!

٣- هاوسەرگیری مەکە لەگەڵ کەسێك کە دەتوانێت لەگەڵتدا بژی، هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکدا بکە کە ناتوانێت بەبێ تۆ بژیت!

٤- بۆ ئەوەی بەختەوەر بیت لەگەڵ هاوسەرەکەت، هەوڵبدە زۆر خۆشت بوێت، ئەگەرنا هەرگیز لە یەکتری تێ ناگەن.

٥- بۆ ئەوەی ببیتە خاوەنی خێزانێکی بەختەوەر، فێری سێ شت ببە: (خۆشەویستی، بەخشندەیی، لێبوردن)، هاوسەرەکەت خۆشبوێ بە گوفتارو کردار، بەخشندەبە لە هەستو سۆزتدا، لێی ببورە ئەگەرچی ئەویش لێت نەبورێت!

٦- چاکترین شت کە لە تواناتدا هەیە پێشکەشی منداڵەکانتی بکەیت ئەوەیە کە هاوسەرەکەت خۆش بوێت.

٧- هیچ شتێك پێشکەش ناکەیت بە خۆتو کۆمەڵگەکەت، ئەگەر خۆشویستنو گرنگیدانت پێشکەش نەکەیت بە خێزانەکەت!

٨- ژیانی هاوسەری وەکو گەوهەرێکی بە نرخ وایە، جوانیو رووناکییەکەی بڵاو دەبێتەوە، پاسەوانە بڕوا پێکراوەکەشی بریتییە لە خۆشەویستی!

٩- باشترین هاوسەر بریتییە لە زانایەکی شوێنەوارناس، چونکە تا خێزانەکەی بچێتە تەمەنەوە زیاتر گرنگی پێ دەدات!

١٠- هاوسەری دانا کاتێك خێزانەکەی زۆر قسە دەکات، پێی ناڵێت بێدەنگ بە، بەڵکو دەڵێت خۆشەویستەکەم جوانییەکانت زیاتر دەردەکەوێت کاتێك کە بێدەنگی هەڵدەبژێری!

١١- ئەگەر دەتەوێت بگەیتە دڵی هاوسەرەکەت پێی مەڵێ تۆ جوانیت، پێی بڵێ هیچ ئافرەتێکم بە وێنەی تۆ نەدیوە!

# پاداشتی چاکە

کارزان عبدالقادر احمد



رۆژێك جوتیارێکی هەژاری سکۆتلەندی بەمەبەستی پەیداکردنی بژێوی بۆ خێزانی بەرەو کێڵگەکەی بەرێ دەکەوێت لە ناکاو گوێ بیستی هاواری یارمەتی دەبێت لە گۆمێکی نزیك کێڵگەکەی، جوتیارەکە ئامێرەکانی دەستی فرێ دەداتو بەرەو گۆماوەکە دەروات دەبینێت منداڵێك کەوتۆتە ناو گۆمەکەوەو لە هەوڵی خۆ رزگار کردندایە، بەڵام هەر چەند دەکات ناتوانێت خەریکە ژێر ئاو دەکەوێتو دەخنکێت، هەر بۆیە جوتیارەکە لە گۆمەکەدا دەری دەهێنێتو لە مردن رزگاری دەکات.

بۆ رۆژی دوایی ئۆتۆمبێلێکی گران بەها لەبەر دەم ماڵی جوتیارەکەدا دەوەستێت، کابرایەکی پلەو پایە بەرزی تێدایە خۆی بە جوتیارەکە دەناسێنێت کە (باوکی ئەو منداڵەیە کە دوێنێ رزگاری کردووە)، کابرای پلەوپایە بەرز بە جوتیارەکە دەڵێت: لە بەرامبەر رزگارکردنی کورەکەمدا دەمەوێت پاداشتت بکەم، بەڵام جوتیارەکە رازی نابێت بەرامبەر ئەو کارەی کردویەتی هیچ پاداشتێك وەربگرێت، لەو کاتەدا منداڵی جوتیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە کابراکە بە جوتیارەکە دەڵێت: ئەمە کوری خۆتە، جوتیارەکە دەڵێت: بەڵێ، کابراکە دەڵێت: باشە با منو تۆ رێککەوین لەسەر ئەوەی کورەکەت لەسەر حسابی من بچێتە خوێندنگا هەر وەکو کورەکەی خۆم ئەگەر کورەکەت وەکو باوکی وابێت ئەوا لە پاشەرۆژدا هەموو لایەکمان شانازی پێوە دەکەین، جووتیارەکە رازی دەبێت بۆیە کورەکەی چووە باشترین خوێندنگا، لە پاشان خوێندنی تەواو کرد لە خوێندنگای پزیشکی (سانت ماری) لە (لەندەن)ی پایتەختی (بەریتانیا). لەدواییدا ناوبانگی بە هەموو جیهاندا بڵاو بۆوە بە (الکسندر فلمنج) دۆزەرەوەی ( پنسلین). پاش چەندساڵێك منداڵی کابرای پایە بەرز کە جووتیارەکە رزگاری کرد، تووشی نەخۆشی (هەوکردنی سی) دەبێت بەڵام ئەم جارە کوری جوتیارەکە دکتۆر (فلمنج) رزگاری دەکات بە دۆزینەوی دەرمانی پەنسلین، کە لەدواییدا ملیۆنەها مرۆڤی تری رزگار کرد.

ئایا دەزانیت ئەو کابرا پایە بەرزە کێ بوو؟: (راندولف تشرشل) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بوو کە بەریتانیای لە کوشتنو خوێن رشتن رزگار کرد لە جەنگی جیهانیدا، کورەکەشی (ونستون تشرشل) بوو.

لایەنی سەرکەوتنو پۆزەتیڤی مرۆڤ لەوەدایە کە تەنها بۆ خودی خۆی نەژی، هەروەها سەرکەوتنی مرۆڤ لەوەدایە ئەو هەلە بقۆزێتەوە کە دێتە رێگەی.

هکذا هزموا اليأس - لسلوى العضيدان (انترنيت).



پارێزەر: ئازاد محی الدین کریم

# یاریکردن لەگەڵ منداڵدا

یاریکردنو گاڵتەکردن لەگەڵ منداڵدا لە گرنگترینو سەرکەوتووترین ڕێگەکانی پەروەردەکردنی منداڵە، کە بە هۆیەوە منداڵ زیاتر ئاشنایی لەگەڵ گەورەکاندا بە تایبەت دایكو باوکیدا پەیدا دەکات، دواتر هیچ نهێنییەکی خۆی لە گەورەکان ناشارێتەوەو بەردەوام پرسیان پێدەکاتو ڕاوێژیان لەگەڵ دەکات سەبارەت بەو کێشەو گرفتانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە.

پێشەوا (غەزالی) کە یەکێکە لە زانا ناوازەو بە ناوبانگەکانی بواری پەروەردە سەبارەت بەگرنگی یاریکردن لەگەڵ منداڵدا دەڵێت:

پێویستە بواری یاریکردن بۆ منداڵان بڕەخسێنرێت تاوەکو پشوو بدەن لەو ماندووبوونەی کە بەهۆی خوێندنو کارەکانی ترەوە دووچاری بوون، چونکە قەدەغەکردنی منداڵان لە یاریکردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو منداڵە وا هەست بکات کە تەنها بۆ خوێندنو کاری گەورەکان خوڵقێنراوە، دواتر هەست بە نارەحەتییەکی زۆرو ماندووبوونێکی دەروونی دەکات، بە بەراورد لەگەڵ منداڵانی تری هاوپۆلیو هاوتەمەنی خۆیو گەشەی لاشەییو ژیری کەمتر دەبێت، لە سیماو ڕوخساریشیدا جۆرێك لە نائومێدی بەدی دەکرێت، هەمیشە بەدوای هەلێکدا دەگەڕێت کە خۆی لەو قەیرانە قوتار بکات.

هەروەها ئەو زانا پایە بەرزە ئاماژەی داوە بە چەند سودێکی یاریکردنی منداڵان لەوانەش:-

یەکەم: سوودی لاشەیی:

ئەو یاریانەی کە جوڵەیان تێدایە زۆر پێویستن بۆ گەشەکردنی ماسولکەی منداڵ، بەهۆی ئەو یاریانەوە منداڵ شارەزای وزەو تواناو لێهاتوویی جەستەی خۆی دەبێت.

دووەم: سوودی پەروەردەیی:

یاریکردن بوار بۆ منداڵ دەڕەخسێنێت کە بە هۆی ئامرازەکانی یارییەکەوە فێری زۆر شتی دەوروبەری ببێت وەك شێوازو ڕەنگو قەبارەو جلوبەرگە جیاوازەکانی دەوروبەر، تەنانەت زۆر جار منداڵ بەهۆی یاریکردنەوە فێری هەندێك شت دەبێت کە مەحاڵە بەهۆی کاری ترەوە فێریان ببێت.

سێیەم: سوودی کۆمەڵایەتی:

بەهۆی یاریکردنەوە منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بێت چۆن پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بنیاد بنێ لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا، هەروەها چۆن هەڵسوکەوتی باش لەگەڵ کەسانی تردا بکات، فێری هاوکاریو یارمەتیدانی کەسانی تر دەبێتو بەتایبەتیش یاریکردن لەگەڵ گەورەکاندا یارمەتی دەدات لە ئاشنابوونو گەیشتن بە ئەزموونی ئەوان.

چوارەم: سوودی ڕەوشتی: بەهۆی یاریکردنەوە منداڵ فێری مانای ئەو وشەو بەهایانە دەبێت کە پێشتر تەنها گوێبیستی ناوەکانیان ببوو، وەك: (چاك، خراپ، ڕاستگۆیی، دادپەروەری، یەکسانی، هاوکاری، دەست پاکی.... هتد).

پێنجەم: سوودی داهێنان:

هەر بەهۆی یاریکردنەوە منداڵ دەتوانێ ئەو تواناو بیرۆکەو داهێنانانەی کە لە ناخیدایە درکیان پێ بکاتو ئاشکرایان بکاتو خزمەتیان پێبکات.

شەشەم: سوودی چارەسەری:

بەهۆی یاریکردنەوە منداڵ هەست بەحەوانەوەی جەستەییو دەروونی دەکاتو ڕزگاری دەبێت لەو دڵە ڕاوکێیانەی کە بەهۆی کۆتو بەندی دانراو لەسەری دوچاری دەبێت، بۆیە دەبینین ئەو منداڵانەی کە کۆتو بەندیان لەسەردانراوە لەلایەن گەورەکانەوە کاتێك کە بواریان بۆ دەڕەخسێت لە منداڵە ئاساییەکان زیاتر یاری دەکەنو دەیانەوێ قەرەبووی ئەو ساتانە بکەنەوە کە تێیدا گیرۆدەی ئەو کۆتو بەندو دڵە ڕاوکێ دەروونیانە بوون.

بەڵام پێویستە لەوە ئاگاداربین کە چەندین یاری هەن لایەنی نێگەتیفیان زیاترە لە لایەنی پۆزەتیف.

لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ولایەتی

(ئەلینوێ)ی ئەمریکی لێکۆڵینەوەیەك ئەنجام درا لەسەر ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە نێوان (٥-١٠)ساڵیدا بوو، لێکۆڵینەوەکەش لەسەر ئەومنداڵانە کرا کە یارییە شەڕەنگێزو ئاگرینەکانیان بەکاردەهێنا، لەگەڵ ئەو منداڵانەی کە هۆگری جۆرەکانی تری یاری بوون.

لێکۆڵەر بۆی دەرکەوت کە ئەو منداڵانەی یاری ئاگرین بەکاردەهێنن کەسانی تورەو شەڕەنگێزن، بەڵام ئەو منداڵانەی کە جۆرەکانی تری یاری بەکاردەهێنن کەسانی تا رادەیەك هێمنو ئارامو لەسەرخۆن.

تەنانەت ئەو فیلم کارتۆنانەی کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە پەخش دەکرێن هەریەکەیان جۆرە کاریگەرییەك لەسەر دەروونو ئاکاری منداڵ دروست دەکات، بۆیە پێویستە دەزگاکانی راگەیاندن ئەو فیلمانە پەخش بکەن کە گیانی هاوکاریو یارمەتیدانو بەخشندەییو بەها جوانەکان لەناو ناخی منداڵاندا دەروێننو دەروونیان ئاسوودە دەکاتو بیر تیژو زیرەكو بە توانایان دەکات.

هەروەها پێویستە لەسەر گەورەکان بەتایبەت دایکانو باوکان کە ئەو یاریانە بۆ منداڵەکانیان دەستەبەر بکەن کە بە سوودن بۆ لاشەو بیرو دەروونو تەندروستی منداڵەکەیان، یارمەتیدەریان دەبێت لە لاسایی کردنەوەو چاولێکەریکردنی هەڵسوکەوتو ئاکارە جوانەکانی گەورەکانو چۆنییەتی بیرکردنەوەیان.

لەکاتی کرینی یارییە بەسوودەکاندا هۆکاری کرینی ئەو جۆرە یارییانەیان بۆ باس بکرێت، بۆ نموونە بوترێت: ئەم یاریانە بەسوودترن نرخیشیان زیاترە لەوانی تر، یان ئەمە یارییەکەی فلان هاورێتە ببینە چەند چاکە، چەند جوانە.....

یان کاتێك قەدەغەی دەکەیت لە کرینی یارییەك هەروا پشت گوێی مەخە تاوەکو هۆکاری قەدەغەکردنەکەتی بۆ باس نەکەیت، چونکە هەموو قەدەغە کراوێك دەروونی مرۆڤ ئارەزووی دەکات (کل ممنوع مرغوب).

بەڵکو هۆکاری قەدەغەکردنەکەتی بۆ روون بکەرەوەو نموونەی بۆ بێنەرەوە، بۆ نموونە پێی بڵێ: فلان کەس بەو یارییە بریندار بوو، یان فلان هاورێت بەردەوام سەرقاڵی ئەو جۆرە یاریانەیە بۆیە لە خوێندن دوا کەوتووە.

بەم جۆرە پاساوێکی راستو دروست دەخەیتە بەر دیدو تێروانینی منداڵەکە لەهەمان کاتیشدا منداڵەکە متمانەی زیاتری بۆ دروست دەبێتو لەوە دڵنیا دەبێت کە ئەو گەورەیە دڵسۆزو خەمخۆری دوا رۆژی ئەم منداڵەیە.

# بە هاوشێوەی رەفتارەکانی خۆی پاداشت درایەوە

و: هێمن محمد علی

رۆژێك حاجی حسین لەگەڵ هیوای کوریدا دەچن بەرەو بازارێکی نزیك خۆیان، لە رێگەدا لە نزیك سێبەری درەختێك چاویان بە قەرەباڵغییەك دەکەوێت، دەبینن خەڵك لە دەوری پیرەمێردێك خر بوونەتەوە، کاتێك لە خەڵکەکە نزیك بوونەوە گوێیان لە دەنگو گریانی پیرەمێردێکی بەساڵاچوو بوو.. زۆر بەکوڵ دەگریاو خەڵکەکەش دەوریان دابوو...

حاجی حسین بە هێمنی لە پیاوێکی پرسی: ئەم قەرەباڵغییە چییە؟ شتێ روویداوە؟ ئەی ئەم پیاوە بۆ دەگری؟!

پیاوەکە وەڵامی دایەوەو وتی: ئەم پیاوە پیرەی دەیبینی لەگەڵ کورەکەیدا بەشەرهاتووەو کورەکەش زۆر بە درندانە ئازاری باوکە پیرەکەی داوە!!

حاجی حسینو هیوای کوری سەریان سورما!! چۆن مرۆڤ دەستی دەچێتە باوکیو دەتوانێت ئازاری بدات؟! ئەی کوا سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر ئەو باوکە ریش سپییە؟! ئەی هەر باوك نییە وەکو مۆم تەمەنی خۆی بۆ روناکی رێگەی منداڵەکانی دەسوتێنێت؟! ئای دەبێت چەندان رۆژ لەبەر قرچە قرچی گەرماو لەبەر بەفرو کرێوەو سەرماو شەختە بەیانی تا ئێوارە لە هەوڵی پەیداکردنی پارووە نانێکدا بووبێت!! سەرو ریشی رەشی لە پێناو منداڵەکانیدا سپی کرد!! بەژنو باڵای رێکی لە کارو کاسپیدا چەمی!! سەرەنجام بەم شێوەیە پاداشت دەدرێتەوە!!

حاجی حسین کەمێك لە پیاوە پیرەکە نزیك بۆوەو بە ئاخو حەسرەتەوە وتی: «کما تدین تدان» بەڵێ پاداشتی کردارەکانی وەرگرتەوە!! خەڵکەکە بە سەرسورمانەوە وتیان: چی؟! هەروەها هیوای کوریشی لە قسەکەی باوکی سەری سورما!! باوکە ئەوە چیت وت؟! « کما تدین تدان» مانای چییە؟! حاجی حسین وتی: من ئەم پیاوە پیرە باش دەناسم، ئەم پیاوە فلانی کوری فلانە...

رۆژێك لەگەڵ باوکمدا بەم شوێنەدا تێدەپەرین، ئەم پیاوە پیرە ئەو کاتە گەنج بوو، ئا لەم شوێنەدا زۆر بەخراپی لە دەمو چاوی باوکی دەداو پیایا دەکێشا!!

ئەوەتا ئێستا هەر لەم شوێنو جێگەیەدا کورەکەی بەهەمان شێوە تۆڵەی باپیرەی لە باوکی دەکاتەوەو بە بەرچاوی ئەم خەڵکەوە ئازاری داوە...

بەڵێ.. راستییان وتووە، چی دەکەیت بیکەو چی بچێنیت هەرئەوە دەدوریتەوەو کردارەکانت بەچی کێشانەو پێوانە بکەیت هەر بەوەش بۆت کێشانەو پێوانە دەکرێتەوە...

هەرکەس ئازاری دایكو باوکی بدات، بە دڵنیاییەوە کاتێك پیر دەبێت منداڵەکانی ئازاری دەدەنو دڵی دەشکێنن.. ئا لەم کاتەدا پیاوە پیرەکە سەری هەڵبریو سەیری حاجی حسینی کردو وتی: بەڵێ راست دەکەیت، ئێستا سزای کردارەکانم وەردەگرمەوە... کاتێك خەڵکەکە گوێیان لەم قسانە بوو، بڵاوەیان لێکرد..

هیواش پرسیاری کردو بەباوکی وت: باوکە پێوستە رەوشتو کردارمان چۆن بێت لەگەڵ باوكو دایکماندا بۆ ئەوەی وەك ئەم پیاوە پیرەمان بەسەر نەیەت؟ باوکیشی وتی: کوری خۆم رێزی باوكو دایك ئەوەندە گەورەیە خودای گەورە لەگەڵ پەرستنی خۆیدا باسی کردووەو لەچەندان شوێنی قورئانی پیرۆزدا باسی ئەوە دەکات کە لەگەڵ باوكو دایکدا جوان هەڵسوکەوت بکەن..

کوری شیرینم هەرگیز لە پێش باوكو دایکتەوە مەرۆو هەنگاو مەنێ...

لە پێش دایكو باوکتدا دامەنیشەو بەناوی خۆیانەوە بانگیان مەکەو دەنگیان بەسەردا بەرز مەکەرەوەو بەچاوی رقو قینەوە سەیریان مەکە...

لە کارەکانتدا راوێژیان پێبکەو هەرگیز درۆیان لەگەڵ مەکە.. رێز لە دۆستو هاوەڵەکانیان بگرەو هەوڵ بدە ئەو کارانەیان زوو بۆ ئەنجام بدە کە دڵخۆشیان دەکات..

هەرکات لە گەرانەوەتدا دواکەوتی زوو داوای لێبوردنیان لێ بکەو بەبێ پرس سەفەر مەکە.. کۆتا ئامۆژگاریم بۆت ئەوەیە: هەرگیز فەزڵی هاوسەرو منداڵەکانت مەدە بەسەر باوكو دایکتدا، چۆن لە پاشەرۆژدا منداڵەکانت خۆش دەوێت، دڵنیابە ئەوانیش ئاوا تۆیان خۆش دەوێتو هەموو هەولێکیان داوە بۆ ئەوەی خۆش بەختو کامەران بژیت...

# منداڵ و درۆکردن ١/٢

نا: کامەران محەمەد نەمین ئیسماعیل – رانیە

درۆکردن بریتییە لەو زیادە ڕۆییە کە منداڵ لە وەسفی شتێکدا دەیکاتو سنور دەبەزێنێو دەبێتە سەرەتای درۆکردن، یان باسکردنی شتێك لە لایەن کەسێکەوە کە راستو دروست نییە لە رووی قسەکردنو رەوشتدا، یاخود هەڵخەڵەتاندنو فریودانی کەسێکە لە پێناو بەدەست هێنانی سوودێکدا بۆ خۆی، یان دەکرێت بڵێین درۆکردن سیفەتێکی نائاسایی منداڵەو لە دەوروبەرەوە وەریدەگرێ کە تیایدا لە دایك دەبێو دەژی، گەلێك جاریش درۆکردنەکانیان لە ئەنجامی ترسەوە دەبێ یاخود ئامرازێکە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجو خواستو بەرژەوەندییەکانی ناخیان هەندێجار زیادە رەوی دەخرێتە سەر شتەکان، کەواتە دەڵێین درۆکردن گواستنەوەی هەواڵە بە پێچەوانەی راستیەکان.

★ بۆچی منداڵ درۆ دەکات؟

- پسپۆرانی بواری دەروونی هاوران لەسەر ئەوەی پاڵنەرە کۆمەڵایەتیو ئابووریو رامیارییەکانو بواری پەروەردەی دەروونی هۆکارن بەگشتی بۆ سەر هەڵدانی درۆکردن.

دەکرێ بڵێین زۆرجاریش منداڵ هانا بۆ درۆکردن دەبات بەوەی کە وەکو پێویست هەلو کەشی بۆ نەرەخساوەو دەرفەتی نەدراوەتێ راستی بڵێ هەستی خۆی بەرامبەر بە منداڵی لە خۆی بچوکتر دەربڕێ، رەنگە وشەی زبرو خۆش نەویستنو توورە بوون شکانەوەی ئازاردانی دەروونیو جەستەیی، هۆکارگەلێکی تر بێ لای منداڵ، زۆر جار ئەگەر منداڵ لەگەڵ بوونی هەر تاوانێك سزا بدرێ لای دایكو باوکی ناچار دەبێ بیر لە درۆ بکاتەوە بۆ خۆدەرباز کردن لەو کارە نەشیاوەو هەڵسوکەوتەی ئەنجامی داوە.

منداڵ کە دادەنیشێ بە حەزوو ئارەزووی دڵی خۆی قسە دەکات، دەبێ لە مانای قسەکانی وردبینەوەو ئارەزووەکانی بزانین، لە هەمان کاتیشدا تێبینی خۆمان هەبێ بۆ سەر قسەکانی ئەگەر نا لەوانەیە بە کەسێکی درۆزنو فشەکەر لە ناو هاوەڵەکانیدا لە قەڵەم بدرێ بەوەی کۆمەڵێك قسە دەوروژێنێو دەکات، بەڵام لە روونکردنەوەی قسەکانیدا بۆت دەردەکەوێ لەو کۆمەڵە قسەیەی درکاندویەتی لێرەو لەوێ دوو قسەی راست نییە!

★ چۆن منداڵ فێری درۆکردن دەبێت؟

- بیرمەندانی بواری پەروەردەیی بەسەر چەند تەوەرێکدا دابەش بوونی بە شێوەی دیدێکی جیاواز بیر دەکەنەوە، هەندێکیان دەڵێن ئەگەر لە سەرەتاوە کۆنترۆڵی منداڵ بکرێو بە رێگەیەکی شیاوو راستەقینە هەنگاوی لەگەڵ بنێ، دەتوانێ کەسێکی راستگۆی لێدەربچێ، ئەگەرنا هەر لە دوای لەدایك بوونەوە بەپێی (خود، خێزان، ژینگەو کۆمەڵگە)، ئەوا لەتاو سیمای کەسێکی درۆزندا خۆی دەبینێتەوە، هەندێ لە رای جیاواز بە پێچەوانەوە ئاماژە بەوە دەکەن نابێت منداڵی تەمەن (٣) ساڵ لە رووی یاساییەوە بەدرۆزن دابنرێت، چونکە دەڵێن منداڵ تا تەمەنی بەرەو ٣ ساڵانە نەروات نازانێ وشەی درۆ چییە، بەڵام دەکرێت هەڵە بکات، چونکە بیرێکی کامڵی تەواوی نییە دەکرێت زۆرێك لە ئەندێشەکانی زاڵبێت بەسەریاو دورکەوتنەوە لە شتە ناسکەکان وەك (یاری- مۆسیقا- فیلم کارتۆن...هتد) ئاشنابوون بە توندو تیژی هەڵەیەکی ترە کە منداڵ بەرەو ئاقارێکی مەترسیدار دەبا، لەگەڵ رێزماندا بۆ دەزگاو کەناڵەکانی راگەیاندن، هەندێ دەرونزانی پەروەردەیی تەنانەت گوێگرتن لە رادیۆو سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەباش نازانن بۆ؟ چونکە لە لایەك کاتێکی زۆر لە بەردەمی ئەو منداڵەدا دەکوژێو لەلایەکی تر لەناو زۆربەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن راستیو ناراستی تێکەڵکراوەو شێوێنراوە، نمونە (فلیمی رامبۆ، جاکشان... هتد) هەر لە دەستپێکی فیلمەکەوە درۆیەکی زۆری تێدا بەدی دەکرێت تا کۆتایی دیمەنی فلیمەکە، خۆ ئەگەر منداڵەکە توانای خوێندنەوەی مانای ئەو فیلمانەی نەبێ ئەوا توانای بینینی هەیە بینەرێکی زۆری منداڵ سەیری ئەم فیلمانە دەکات بەشێك لە تاوانی دەخرێتە بەر منداڵەکەو بەشەکەی تر لە ئەستۆی دەزگاکانی راگەیاندندایە کە ئەم جۆرەفیلمانە پەخش دەکەن...

★ بامنداڵ لە راستی نەتۆرێنین:

بەپێی ماددەی (١٢-١٣) رێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ کە پەسەند کراوە لە لایەن

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، لە بەندی (٣) جاری جیهانی مافی مرۆڤ دا هاتووە دەڵێ (هەموو کەسێك مافی ژیانو ئازادی هەیەو دەبێ ڕێگە بە منداڵ بدرێ لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندییان پێوەی هەیە رای خۆی بداو حسابی بۆ بکرێت، لە ئازادی دەربرین منداڵ مافی هەیە لە چوارچێوەی یاسادا بە ئازادی بیروبۆچونی خۆی دەربرێت)، بۆیە پێویستە دایكوباوك لەکاتی هەڵەکردنی منداڵکانیاندا دان بەخۆیاندا بگرن، بەداخەوە زۆر لەدایكوباوکان بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن زەمینەی درۆکردن بۆ منداڵەکانیان دەرەخسێنن، پێویست ناکات منداڵ لەبەر هەر هەڵەیەك یان چەند هەڵەیەك سەرکوت بکرێتو هەستی بریندار بکرێت، دڵنیابە بە بەرەنگاربونەوەی هیچ کاتێك چاوەروانی ئەوەی لێمەکە کە منداڵێکی راستگۆی لێ دەربچێت، زۆرجار گەورەکان درۆ ئەخولقێنن بێ ئاگان لە منداڵەکانیان کە درك بەم درۆیە دەکەن.

* هۆکارەکانی درۆکردن:-

١- تۆڵە سەندنەوە لەکەسانی دیکە، هەندێجار منداڵ درۆ دەکات بۆ تۆڵە سەندنەوە لە کەسانی دیکە لە ڕێگەی تاوانبارکردن، بۆ ئەوەی سزابدرێت یاخود زەرەرو زیانێك بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێت.

٢- خۆ دە ر خستن و خۆ هە ڵکێشا ن: خۆدەرخستنو خۆهەڵکێشانی کەسی درۆزن لە ناو هاوەڵەکانیدا ئاساییە، تا دەتوانێت حەزدەکات پۆز لێبدات بەسەر هاوەڵەکانیدا بە تایبەتی ئەو هاوەڵانەی باوەر بە درۆکانی دەکەن.

٣- پێدانی پەیمانو بەڵێن بەمنداڵو جێبەجێ نەکردنیان لەلایەن دایكو باوكو مامۆستاکانیانەوە.

٤- کاتێ منداڵ درۆدەکات لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجێکی تایبەتی بۆخۆی سودی لێوەربگرێ، چاکردنی پێداویستییەکانی بێ لە لایەن گەورەکانەوە یان هەرشتێکی تر...

٥- درۆکردن لەپێناو بەرگریکردندا لە هەمان کاتیشدا درۆ بۆ پەرینەوەو دەرباز بوون لە پەردە پۆشکردنی کارەکانیدا بەکاردێنێت.

٦- پێدانی کار بە منداڵ، کە لە توانای ئەودا نییە ئەنجامی بدات، چ جەستەیی یا ژیری، دەبێتە هۆکار بۆ درۆکردن لەو ئەرکە قورسەی پێی سپێردراوە.

٧- هەستکردن بە کەمی لای منداڵ بەتایبەت ئەو کاتانەی کە ستەم دەکا پێداگریو بانگەشە بۆ شتێك دەکا کە موڵکی خۆی نییە.

٨- ترس لە ئەگەری سزادانێکاو ئازار دانێك کە چاوەرێی منداڵ دەکات، لە لایەن دایكوباوکەوە، واتە پاڵنەری ترس زۆرجار لای منداڵ بۆ ئەوە دروست دەبێ کە خۆی لە توندوتیژی بپارێزێت.

٩- زۆر جاران منداڵ بەهۆی بچوکی تەمەنەوە درۆ دەکاتو واتای دۆرکردن نازانێت، واتە توانای نییە جیاوازی بکا لە نێوان راستیو خەیاڵدا.

١٠- ملکەچ نەکردن، ملکەچ نەکردن بۆ وتەکانی خێزانو دەوروبەری کە پێشتر دایکی هیچ راوێژێکی بۆ نەهێشتۆتەوە تا ئەمیش بتوانێ بە ئاسانی هەنگاوی بۆ بهاوێ.

١١- خۆ هەڵکێشانی ئەو درۆیەی کە راستی پێ دەردەخات.

١٢- درۆکردن بەناچاری:- زۆرجاران سەرکۆنەکردن پرسیار لەسەر شتەکانی منداڵ زۆر توڕەو بێزار دەکات، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە دەیخەنە ژێر پرسیارەوە، هەرچەند منداڵ دەزانێ وەڵامی پرسیارەکە لای بابەو دایەیە ئەمیش منداڵەکە ناچار دەکات یا درۆ بکات یان راستییەکان بڵێو (اعتراف) بکات ئەمەش کارێکی سەختە بۆ منداڵ.

* ئاینی ئیسلام چۆن دەروانێتە درۆ (کەسی درۆزن):

خوای مەزن داوامان لێ دەکات ئەگەر هەواڵێکمان بیست بە باشی بچینە بنجو بناوانییەوە، تا بە تەواوی راستیودروستی هەواڵەکەمان بۆ دەردەکەوێت، پاشان بڕوای پێ بکەین، چونکە هەندێ مرۆڤی لاساری ئارەسەن بە درۆ هەواڵ بڵاو دەکەنەوە بە مەبەستی ئاژاوە نانەوەو تێکدانی نێوان خەڵكیو توشی ئازارو ئەشکەنجەیان دەکەنو زیان بە نەتەوەو نیشتمان دەگەیەنن، پێغەمبەری ئازیز (د.خ) دەفەرمووێ [نیشانەی دوو رووی سێ شتن: ئەگەر قسە دەکات درۆ دەکا، ئەگەر بەڵێنو پەیمانیدا نایباتە سەر، ئەگەر بە ئەمین دانرا خیانەت دەکات].

پێغەمبەری ئازیز (د.خ) لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرمووێ [راستگۆیی بەرەو چاکە دەتبا، چاکە بەرەو بەهەشت دەتبا، هەر وەکو چۆن درۆکردن بەرەو خراپە دەتبا، خراپەش مرۆڤ بەرە و دۆزەخ دەبا]، پێغەمبەری (د.خ) دیارە هەمیشەو بەردەوام ئاماژەی بەوە کردووە لەناو کۆرو کۆبوونەوەکان کە بە هیچ شێوەیەك بوار بۆ درۆکردن خۆش نەکەن، لەبەرئەوەی کۆمەڵێك کارەساتی دڵتەزێنی لێ دەکەوێتەوە، درۆکردن لە ئاینی ئیسلامدا بە یەکێك لە تاوانە گەورەکان دادەنرێ، خوای گەورە بەچاوی سوۆز و بەزەییەوە ناروانێتە کەسی درۆزن، کەسی درۆزنیش لە دنیاو دوارۆژدا بێ رێز سەیر دەکرێت.

## وانەیەك بۆ ژیان

قسە ئەگەر لەدڵەوە بوو
بەر دڵ دەکەوێت!
ئەگەر لە زمانیشەوە بوو
بەر گوێچکە!!

## هەستی حەوتەم

# من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم!

نەسیم سەمادي
سەرنووسەری (خلاصات - المختار الاداري - علاقات)

لەم دواییەدا هەلی بەشداری کردنم لە ژمارەیەك لە پێشانگاکانی کتێب دا بۆ رەخسا، بەهۆی خوێندنەوەی بابەتە جۆراو جۆرەکانەوە کەوتمە بیرکردنەوەو پرسیار گەلێکی نوێم لە لا دروست بوو... بیرۆکەکان لە پرسیارەکانەوە یان وەڵامەکانیانەوە هەڵدەقوڵێن و دێنە کایەوە، ئێمە بیر لەهەندێ مەسەلە دەکەینەوە، ئاستەمە بگەینە بیرۆکەیەك بێ ئەوەی پرسیارێك بکەین یان وەڵامی کەسێکی تر بدەینەوە.

لەو پرسیارانەی لام دروست بوو ئەوەبوو بۆچی تۆمارکردنی کتێبەکانی چێشت لێنان هەمیشە لە فرۆشتنەکاندا لە بەرزترین ئاست دایە؟

لە پێشانگای (أبوظبي) بۆ کتێب کە چەند مانگێك لەمەو پێش نمایش کرا، زۆربەی ئەوانەی سەردانیان کردبوو بە دەیانیان ریزیان بەستبوو ئەو کتێبانەی دەربارەی چێشت لێنان بوو دەیانکڕی یان تەماشای نمایشی چێشت لێنانیان بە زیندوویی دەکرد.

کتێبی چێشت لێنان کێبەرکێ لەگەڵ هیچ کتێبێکدا ناکات بێجگە لە کتێبی بەناوبانگی (گیتس) بۆ ژمارەی پێوانەیی، ئەمەش کتێبێکی هەمە رەنگە هەرکارێك یان هەرشتێك کە لە سنوری سروشتی تێپەڕ دەکات تیایدا تۆمار دەکرێت، گەڕانەوە بۆ ئەم کتێبە تەنها بۆ خۆشییە نەك خوێندنەوەی پەڕەکانی لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی.

تەنانەت لە کتێبی (گیتس) دا ژمارەی پێوانەیی بۆ گەورەترین پیتزا یان درێژترین لەفە یاخود گەورەترین قاڵبی کێك گرنگیدانی یەکەمی پێ دەبەخشرێ.

لەساتی یەکەمدا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ئاسانە، لەسەر ئەوەی کە دەوترێ رێگەی گەیشتن بە دڵی پیاو لەگەدەیەوە دەست پێ دەکات، بەڵام بۆ ئەم وەڵامە پێویست بوو زۆربەی میوانانی پێشانگاکە ئافرەت بونایە، ئەوەش راست نییە هەروەك پێویستە ئەو رێگەیەی لەگەدەوە دەست پێ دەکات لە دڵەوە کۆتایی پێ بێت، بێ ئەوەی بە عەقڵدا تێپەڕ بێت.

بەڵگە هێنانەوە لەم زەمەنەی کە مادە زاڵ بووە تێیدا گرانە، وایکردووە کە نێوانی مرۆڤ و رۆمانسیەت چەندین میلیان لە نێوان دایە!

شتێکی بەڵگەنەویستە کە غەریزەی مرۆڤ رۆڵێکی بەرچاوی هەیە، (ماسلۆ) پێداویستییە سەرەکیەکانی بوونی داناوە بەشێوەیەك کە خواردن و خواردنەوەی لە یەکەمینەکان داناوە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە پێداویستییەکانی تێرکردنی هزرو بیری لە پێش پێداویستی بەدەست هێنانی خودەوە دێت، ئایا دەکرێت چاوەکانی مرۆڤ نابینا بن لە ئاست هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی بوونی بێ ئەوەی خۆی بەدەست بهێنێت؟

ئەگەر ئەوە بەڕاستی رووبدات .. پێ دەچێت رووبدات.. ئەوا گەشەی هەمیشەیی کۆمەڵگاکان و شارستانییەکان دەبێتە جێی گومان.

هەروەك (دیکارت) دەڵێت: «من بیر دەکەمەوە... کەواتە من هەم» ئەم وتە فەلسەفیە نوێ یە بۆ سەلماندنی بوونی مرۆڤ دەبێتە: من چێشت لێ دەنێم و دەخۆم کەواتە من هەم!

بەڵام دەتوانین بوونی خۆمان بسەلمێنین بێ ئەوەی چێشت لێ بنێین.. ئێمە بونمان هەیە لەبەر ئەوەی پیتزاو هەمبەرگرو کنتاکی دەخۆین بێ ئەوەی خۆمان ئامادەی بکەین!

لە بەخێوکردن و پێگەیاندنی منداڵەکانماندا هەمیشە پاروقوتدان پێش فێرکردن و راهێنان دەکەوێت، ئەمەش هۆیەکی ترە کە خۆراك پێدانی سك پێش خۆراك پێدانی مێشك دەکەوێت!

پرسیارێکی تر: ئەگەر هەڵاوێری هەستی شەشەممان کرد لەبەرئەوەی هەستێکی ئەندامی نییە، کەواتە ژمارەی هەستەکانی مرۆڤ چەندە؟

هەموو وا دادەنێین پێنج هەستەو ئەوانیش چەشتن، دەست لێدان، بۆنکردن، بینین و بیستن. چەند هەستێکی تری ئەندامی هەیە کە لە بیرکراوە! کێ دەتوانێ هەستی ئەندامی زیاتر بخاتە سەر هەستەکانی تر؟ با بینێرێت بۆ نوسینگەی گۆڤاری (بریار)، بەڵام وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستی بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەو گەڕان هەیە نەك بۆ کتێبی چێشت لێنان یا ژەمی «دلیفری!».

